سر ارادت ما و آستان حضرت دوست

که هرچه بر سر ما می‌رود ارادت اوست

نظیر دوست ندیدم اگرچه از مه و مهر

نهادم آینه‌ها در مقابل رخ دوست

صبا ز حال دل تنگ ما چه شرح دهد

که چون شکنج ورق‌های غنچه تو بر توست

نه من سبوکش این دیر رندسوزم و بس

بسا سرا که در این کارخانه سنگ و سبوست

مگر تو شانه زدی زلف عنبرافشان را

که باد غالیه‌سا گشت و خاک عنبربوست

نثار روی تو هر برگ گل که در چمن است

فدای قد تو هر سروبن که بر لب جوست

زبان ناطقه در وصف شوق نالان است

چه جای کلک بریده زبان بیهده گوست

رخ تو در دلم آمد مراد خواهم یافت

چرا که حال نکو در قفای فال نکوست

نه این زمان دل حافظ در آتش هوس است

که داغدار ازل همچو لاله‌ی خودروست

چـــاوم لە لوتفی دۆســە لەســەر ئەو خەتـا نـەڕۆن
تـاوانی من بچـووکە، کــەرەم گەورە عەفـوی تۆن
بەخشیــنی ئێمــە ســەهلە دەزانـــم جەنـــابی یـــار
هەرچـەن پەری سرشتـــە، بەلاَمــێ فریشتـــە هۆن
بەو شێــوە گەرمــەشینمــە، کەس کەس ئەمـا نەڵێت
ئەم جۆگــە پڕ لە لەعلــە ئەرێ چیــن و کامە جۆن؟
ون بـــوو دەمی شــەکەریەتی نەدیــار و بێ‌نیشـــان
یەک موو فەقەت کەمەریەتی ئەمما چ موو چلۆن؟!
نەخشــی خەیالــی چۆنە نەشـــۆراوەتۆ لــە ســـەر
دوو دیـدە خـۆ هەمیشــە لە گریـــان و شستـوشۆن
بێ گفتــوگۆ بە زولفـــی ئەکێشێ دەرون، مەگــەر
زولفی درێژ و دڵکــەشی ئەو گـوێ لە گفتـوگۆن؟
عومرێکــە بۆنـی پەرچــەمی ئێـــوەم ژنـەفتـووە
هێشتـــا لە مێشکمـــا وەکــو ئەوڕۆ بە ڕەنگ و بــۆن
«حافـــز»! گـــرانە بۆ مــە پەرێشـــانـدڵـی، بەلاَم
چـون بۆ عەبیـری زولفـی پەرێشـــانە غـەم مەخۆن
«کۆلیـــل» تـا غولاَمــە لە ئەرکـــی جەنـــابی دۆس
سوڵتـــانی کۆی سەبایـــە سولەیمـــانی پڕشکـــۆن

دارم امید عاطفتی از جانب دوست

کردم جنایتی و امیدم به عفو اوست

دانم که بگذرد ز سر جرم من که او

گرچه پریوش است ولیکن فرشته خوست

چندان گریستم که هر کس که برگذشت

در اشک ما چو دید روان گفت کاین چه جوست

هیچ است آن دهان و نبینم از او نشان

موی است آن میان و ندانم که آن‌چه موست

دارم عجب ز نقش خیالش که چون نرفت

از دیده‌ام که دم به دمش کار شست‌وشوست

بی گفت‌وگوی زلف تو دل را همی کشد

با زلف دلکش تو که را روی گفت‌وگوست

عمری‌ست تا ز زلف تو بویی شنیده‌ام

زان بوی در مشام دل من هنوز بوست

حافظ بد است حال پریشان تو ولی

بر بوی زلف یار پریشانیت نکوست

ئەو پەیکــە خۆش هەواڵە کە هاتۆ لە شـاری یار
هێنـــای چـــاوەزار و خـەتی موشکبـــاری یـــار
خۆشـی دەوت لە وەسفی کەماڵ و جەماڵی دۆس
خۆشی لە دەم حەکـــایەتی شـان و ویقـــاری یار
پێـــم دا دڵـم لە مـوژدە وەلێ شـەرمـــەزاری بووم
بێخـەوش نەمبـــوو نەغـدێ پتـــر بۆ نیسـاری یـــار
شوکـری خـــودا کە هیممـــەتی ئیقباڵی چارەساز
پێـــوانی مەیلی دڵمــــە هەمـوو کـار و بـاری یار
مانگ و فەلـــەک کە بێدەسـەڵاتن لە دەوری خۆ
هـــەروا لە دەوری دۆس و قـــــەرار و مەداری یار
تۆفـــانی توندی فیتـــنە دو عــــالەم بنێـتە یەک
ئێمـــە و شـەمی دو دیدە لە رێی لوتفی یـــاری یار
بێـــنا کلـێ بە جەوهـــەری بیـــنایی ئەی سەبـــا
تێکـــەڵ بە خـــاکی پـــاکی دەر و رێگوزاری یار
ســـەر خاکســـــاری رێگەنیـازی سەراکـــــەتین
تا چـاوی کێ بە خەو چێ لە کۆش و کەناری یار
دژمـن لە عەیبـی «حافز» ئەڵێ هەرچی بـــا بڵێ
خوایـــا سـوپاسی ئێــوە کە نیـم شەرمەزاری یار
«کۆلیـل»ـی ئەی رەقیبە قەڵەم خوێن و جەوهەری
دڵگەرمی لوتفـی دۆسە شنـەی (سەرچنـار)ی یار

آن پیک نامور که رسید از دیار دوست

آورد حرز جان ز خط مشکبار دوست

خوش می‌دهد نشان جلال و جمال یار

خوش می کند حکایت عز و وقار دوست

دل دادمش به مژده و خجلت همی‌برم

زین نقد قلب خویش که کردم نثار دوست

شکر خدا که از مدد بخت کارساز

بر حسب آرزوست همه کار و بار دوست

سیر سپهر و دور قمر را چه اختیار

در گردش‌اند بر حسب اختیار دوست

گر باد فتنه هر دو جهان را به هم زند

ما و چراغ چشم و ره انتظار دوست

کحل الجواهری به من آر ای نسیم صبح

زان خاک نیکبخت که شد رهگذار دوست

ماییم و آستانه‌ی عشق و سر نیاز

تا خوابِ خوش که را برد اندر کنار دوست

دشمن به قصد حافظ اگر دم زند چه باک

منت خدای را که نیم شرمسار دوست

سـەبا دەخیـلە بـڕۆ بۆ ولاتـی دڵبـەری دۆس
لە زولفی سومبـولی تەڕ بێنە! بێنی عەنبەری دۆس
بـە گیـانی ئـەوا! کە لە مزگێنیـیا ئەدەم گیـانم
لە تۆم ئەگەر خەبەرێ بێت و زولفی چەمبەری دۆس
وەگـەر نەبوو بە نەسیبت حوزووری خەڵوەتی یـار
بهێـنە بۆ دییـە تۆزێ لە خـاکی بەر دەری دۆس
منـی هـەژار و خەیـاڵـی گەیین بە ئەو، هەیهـۆ!
مەگەر بە خەونی ببیـنم جەمـاڵی مەحشـەری دۆس
دڵی سنـەوبەری من چەشنـی دارە بـی لـەرزی
لە تـاوی قـامەتی بەرزی وەکوو سنەوبەری دۆس
ئەگەرچـی دۆس بە هیچێـك ناکـڕێ ئێمـە
بە هـەر دو عـالەمی نادەین موویەکی سـەری دۆس
لە بەنـدی غەم دڵـی ئـازا مەگـەر ببێ، چ دەبێ
هـەژارە «حافـز»ی عاشق، غولام و نۆکەری دۆس
بەری وەری تەمـەن ئاخـۆ دڵی حـەزی «کۆلیـل»
دەبێ بە قسمـەتی بۆنێ لە باخـی نۆبەری دۆس؟!

صبا اگر گذری افتدت به کشور دوست

بیار نفحه‌ای از گیسوی معنبر دوست

به جان او که به شکرانه‌ی جان برافشانم

اگر به سوی من آری پیامی از بر دوست

و گر چنان که در آن حضرتت نباشد بار

برای دیده بیاور غباری از در دوست

من گدا و تمنای وصل او هیهات

مگر به خواب ببینم خیال منظر دوست

دل صنوبریم همچو بید لرزان است

ز حسرت قد و بالای چون صنوبر دوست

اگرچه دوست به چیزی نمی‌خرد ما را

به عالمی نفروشیم مویی از سر دوست

چه باشد ار شود از بند غم دلش آزاد

چو هست حافظ مسکین غلام و چاکر دوست

ئافــەرین پەیکـی بەشــارەت بۆم بلێ پەیغـامی دۆس
تا بکـــەم گیانم بەلاگـــەردانی هۆش و فــامـی دۆس
شێت و شەیـدا هەر وەکوو بولبـول لە نێو بەند و قەفەس
شین ئەکەم بۆ لێوی شەکر و چاوی وەک بادامی دۆس
دانـەیی خـــالّی فـــریوی دام و نەمـــزانی لـەوێ
چیم بە سـەردا دێ بە دانـەی خاڵ و زولفی دامی دۆس
چەشنی من سـەرمەستـە تا رۆژی قیـامەت هەرکـەسێ
نۆشی گیانی کردبێ یەک قوم لە دەست و جامی دۆس
با لەمـە زیــاتر نەکەم باسی بلّێســەی عەشقــی خــۆم
نەشلّـــەقێـــنێ تا وتــــارم خـــاترەی ئـارامــی دۆس
هەر ئەوەم چاتر بڕێژم چـەم بە سـورمەی گەردی رێـی
حیکمـەتی لوقمانی وا پێ خاکی ژێر پێ و قامـی دۆس
ئەوپەڕی ئــاواتـی من هـەرچـەن ئەون ئەو نایەوێـــم
وا بە ناکـامی دەنێمـــۆ ســـەر لە بەر ئاکـــامی دۆس
ســا بســاچێـــنە و بســووتێ «حافـــز»!! بەو زامـــەوە
چونکە بێدەرمانە دەرد و ســۆزی تۆتۆی زامـی دۆس
شەوکەتی بەژنت دەمی «کۆلیل»ـی بەست و دڵ شوکر
سەر لەنۆ هەڵبوو لە شەوقی روومەتی جەم جامی دۆس

مرحبـــا ای پیک مشتـــاقـان بـــده پیغـــام دوست

تـا کنـم جـان از سـر رغبت فـــدای نـام دوست

والـــه و شیـــداست دایـــم همچـو بلبـــل در قفس

طـوطی طبعـم ز عشـق شکـــر و بـــادام دوست

زلـــف او دام اسـت و خـــالش دانـهی آن دام و مـن

بـــر امیـــد دانـــهای افتـــادهام در دام دوســـت

ســـر ز مستـــی برنگیـــرد تا به صبـــح روز حشـــر

هر که چون من در ازل یک جرعه خورد از جام دوست

بس نگویـــم شمـــهای از شـــرح شوق خـود از آنک

دردســـر باشـد نمـودن بیـش از ایـن ابـــرام دوست

گـر دهـد دستـم کشـم در دیـده همچـون توتیـــا

خـــاک راهـی کـان مشـرف گردد از اقـــدام دوست

میـل من سـوی وصـــال و قصـد او سـوی فـــراق

ترک کـــام خود گرفتـــم تـا برآیـد کـــام دوست

حافـــظ اندر درد او میســـوز و بیدرمـــان بســـاز

زان کـــه درمـــانی نـــدارد درد بـــیآرام دوست

رووتــی کەسێ نەدیت و هــەزارت رەقیبــە هەر

دەم خونچە نـازە چۆنە ئەوەنـدەی ئەدیبــە هەر

کەوتووم ئەگەر لە خـاکی بەری پێت سـەیر نین

وەك من لە ئەم دیـارە هــەزاران غەریبــە هەر

ئەم عەشقــە خانەقـــا و خەرابـــاتی بۆ نیێــیە

لە کوێ جەمــاڵی دلبـــەرە عاشق، رەقیـبە هەر

لە کوێ کە دەیرە، ئەڵبەتە هەر بـاسی راهیب و

ناقووس و دەنگی زەنـگی و خـاج و سەلیبە هەر

کێ عەشقی یاری پێیە لەگەڵ رەحمی یار ئەبێ

ئــەی وای دەرد قـــاتە دەنـا ئەو تەبیـــبە هەر

هــاوار و دادی «حافـز»ی عاشـق چەواشــە نین

باسی ئەویـن و شـەرحی غەریب و عەجیبـە هەر

فەرهـــاد ئەگەر حەکـایەتی شیـرین بڵێ بەڵێ

«کۆلیـــل» ئەگــەر رەوایـەتی کا دڵفــریبە هەر

روی تو کس ندید و هـزارت رقیب هست

در غنچه‌ای هنوز و صدت عندلیب هست

گر آمدم به کوی تو چندان غریب نیست

چون من در آن دیار هزاران غریب هست

در عشق خانقاه و خرابات فرق نیست

هر جا که هست پرتو روی حبیب هست

آن‌جا که کار صومعه را جلوه می‌دهند

ناقوس دیر راهب و نام صلیب هست

عاشق که شد که یار به حالش نظر نکرد

ای خواجه درد نیست وگرنه طبیب هست

فریاد حافظ این همه آخر به هرزه نیست

هم قصه‌ای غریب و حدیثی عجیب هست

هونەر لە مەحـــزەری تۆدا بەیانی بێهونەرین
زمـــان براوە وەلێ دەم بەهـاری شیعری دەرین
فـریشتـەroomەتـی پۆشـی، جنـۆکە نـازفرۆش
وڕ و دەمەق بووە چاوم کە دێوە چۆنە پەرین؟!
بە نووری ئەحمـەد و نـاری ئەبوولەهەب ڕانیـم
دڕوو شەرارەتی بۆ گوڵ رووا، لە چەرخی بەرین
مەپرسـە هۆ چییـە لەم چەرخـە سپڵـە لاوێنـە
گەنێـک خـاوەنی گەنجە و گەلێ لە پیلەوەرین
منێ کە ئەرکی موغـان و تەلاری کووپەمە جێ
کڕینـی تەکیـە بە جـۆیێ نیشانی بێـــخەبەرین
کچـی ترێ کە لە پەردەی زوجاجی و عینەبیـن
مەگەر لە نووری گلاری منن لە لەعل گەرین؟!
تەواوی هۆش و نەزەر بوو سەرم گەورە! دەمــێ
کە ئێستـــە بێدەم و مەستـم سـەلاح بێنەزەرین
شـەراب تێکە کە وەک «حافـز»م گەلـێ هیــوا
بە پشتیـــوانی گـرین و کـەرامەتی ســەحەرین
شکا شەهێنـی هونەر باڵی هەڵفـڕینـی «عومـەر»!
ئـەوەی کە بڵحـە ئەمێستـا تەواری بێهـونەرین

اگـــرچه عـــرض هنـــــر پیش یـــار بی‌ادبـــی‌ست

زبـــان خموش ولیکـن دهـــان پر از عربــــی‌ست

پــــری نهفـــته رخ و دیـــو در کرشمـــــه‌ی حســـن

بسوخت دیده ز حیرت که این چه بوالعجبی‌ست

در این چمـــن گـل بی‌خــــار کس نچیـــد آری

چــــراغ مصطفــوی بـــا شـــرار بـــولهبـــی‌ست

سبب مپـــرس که چـــرخ از چه سفـــله‌پـرور شد

کـه کـــــام‌بخشـی او را بهـــانـه بی‌سببـــی‌ست

به نیـــم جو نخـــرم طـــاق خانقـــاه و ربـــاط

مـــرا کــه مصطبه ایـــوان و پـای خـــم طنبی‌ست

جمـــال دختــــر رز نور چشـــم ماست مگـــــر

کـــه در نقـــاب زجـــاجی و پـــرده‌ی عنبـــی‌ست

هــــــزار عقــــل و ادب داشتـــم مـــن ای خواجه

کنــون که مست خــــرابم صـــلاح بی‌ادبـــی‌ست

بیـــار می کـه چـو حافـــظ هـــزارم استظـــهار

بـه گریـه‌ی سحـــری و نیــــاز نیـــم شبـــی‌ست

خۆشتر لە جەژن و بەژنی ئەوین و بەهار چین
مەیگێڕ بۆ نەهات و درەنگی لە کار چین؟
کاتی خۆشت لە دەس مەدە دەستی کە داوە دەم
ئاخۆ کەس ئاگەدارە دەبەی رۆژگار چین
عومری مە یەک هەناسەیە هاتوو نەهاتە دەر
غەمخۆری گیانی خۆ بە! فرانک و دولار چین
ئاوی ژیان و باخی بەهەشتی بەرین، مەگەر
غەیری شەراب و لێوی شەت وکۆی نیگار چین
دەرۆیش و مەست هەر دو کە سەرخۆشی دڵبەرن
دڵ بەینە نازی کێ؟ سەری ژیرا ئیختییار چین
وەختێ فەلەک نەزانە لە ژێر پەردە چین و چۆن
یا شێخ وس بە! مووچەخۆری پەردەدار چین
تاوانمان بە زۆرە ئەگەر وەک رەقیب ئەڵێ
با پێم بڵێ مەبەستی لە بەخشینی یار چین
زاهید لە ئاوی کەوسەر و «حافز» شەراوی ویست
لەو نێوە ویستی ساقی هەتا چۆنە چار چین
«کۆلیل» مەستی ژار و چزی زولفی گەزۆکی
ئەو نێشە نۆشە بۆ مە شەرابی هەنار چین

خوش‌تر ز عیش و صحبت و باغ و بهار چیست
ساقی کجاست گو سبب انتظار چیست

هر وقت خوش که دست دهد مغتنم شمار
کس را وقوف نیست که انجام کار چیست

پیوند عمر بسته به موییست هوش دار
غمخوار خویش باش غم روزگار چیست

معنی آب زندگی و روضه‌ی ارم
جز طرف جویبار و می خوشگوار چیست

مستور و مست هر دو چو از یک قبیله‌اند
ما دل به عشوه که دهیم اختیار چیست

راز درون پرده چه داند فلک خموش
ای مدعی نزاع تو با پرده‌دار چیست

سهو و خطای بنده گرش اعتبار نیست
معنی عفو و رحمت آمرزگار چیست

زاهد شراب کوثر و حافظ پیاله خواست
تا در میانه خواسته‌ی کردگار چیست

بنـاڵە بولبـول ئەگەر وەک منت سەری یـارین

که هـەر دو عاشـقی زارین و ئیشـمان زارین

لـە ئـەو زەوینـە سـەبـا بۆنی پـەرچـەمی بێنێت

زەمانی وسکـوتی مامـز لـە میسـکی تاتـارین

شـەراو بێـنە هەتـا ئەو کراسـە کنجە وەشۆین

که مەستی لافی غورروورین و مەنگی وەشیـارین

خەیاڵـی پەرچـەمی خاوت نە ئیشی هەر خـاویٚ

که چوونە ژێر قەفی زەنجیـر، کـاری عەییـارین

بریقـەیێکی نهێـنی کە عەشقـی داگـرسـاند

نە لەعلی لێـوە، نە پیـرۆزە خـاڵی مروارین

جەمـاڵی یـار نە کوڵم و کەزێن و چـاو و برۆ

هـەزار نوکتـە هەوێنـی کەمـاڵی نـازارین

قەڵـەندەرانی دڵاوا لەتێـکی جـۆ نـادەن

بە تەخت و ئەفسەری شایێ کە حۆلی سەردارین

بە ئاستـانی جەمـاڵت گـەلێ گـرانە گەییـن

فـڕین بەرەو فەلـەکی گـەورەیی بە دژوارین

سەحـەر بە نازی گـلاری خـومارتم خـەو ئەدی

چەنێ موبارەکە خەونـێ کە بووکی بێـدارین

دڵـی بە ناڵـە مەڕەنجێـنە بەس کە سا «حـافز»!

نەجـاتی تا سەری هەرکەس، بە لوتفی دڵدارین

بەڵـێ ئەوەندە هونەرمـەن هـەژار و «کۆلیـل»ـە

مەگـەر بە خەونـی ببـینێ لە کۆشی ڕزگارین

بنال بلبل اگر با منت سر یاری‌ست

که ما دو عاشق زاریم و کار ما زاری‌ست

در آن زمین که نسیمی وزد ز طره‌ی دوست

چه جای دم زدن نافه‌های تاتاری‌ست

بیار باده که رنگین کنیم جامه‌ی زرق

که مست جام غروریم و نام هشیاری‌ست

خیال زلف تو پختن نه کار هر خامی‌ست

که زیر سلسله رفتن طریق عیاری‌ست

لطیفه‌ای‌ست نهانی که عشق از او خیزد

که نام آن نه لب لعل و خط زنگاری‌ست

جمال شخص نه چشم است و زلف و عارض و خال

هزار نکته در این کار و بار دلداری‌ست

قلندران حقیقت به نیم جو نخرند

قبای اطلس آن‌کس که از هنر عاری‌ست

بر آستان تو مشکل توان رسید آری

عروج بر فلک سروری به دشواری‌ست

سحر کرشمه‌ی چشمت به خواب می‌دیدم

زهی مراتب خوابی که به ز بیداری‌ست

دلش به ناله میازار و ختم کن حافظ

که رستگاری جاوید در کم آزاری‌ست

خوایە ئەو شەوقی دەروونەم شەمی ئاسانەیی کێن
ئەو کزەی گیانە بپرسن گوڵی گیانانەیی کێن
ئێستە کاول‌کەری ژین و دڵ و دینم گوڵی ناز
شەو لەگەڵ کێ دەنووێ شاگوڵی گوڵخانەیی کێن
لەعلی لێوی کە لە لێوی منی لێواو کەوێ!
جامی پێوانەیی کامە و شەمی پەروانەیی کێن
هاوەڵی دەوڵەتی ئەو روومەتە رەخشانە بلێن
ئێوەن و خوا کە بە دەسنووس و بە پەروانەیی کێن
هەر کە ئەفسوونێ ئەکا بۆی و نەبوو کەس خەبەری
ئەو دڵی ناسکی، گوێڕایەڵی ئەفسانەیی کێن
یاڕەب ئەو زوهرە لەقا مانگی من ئەو شاپەرییە
لەعلی بێوێنە و مرواریی شاهانەیی کێن
تا وتم خۆزگە لەگەڵ «حافز»ی دێوانە دەبوو
پێکەنین گرتی و فەرمووی ئەمە دێوانەیی کێن؟
هەر وتم خاڵی رەشی وەک شەوی «کۆلیل» دەچێ
وتی باڵی بکەن ئەم تەیرە لە دووی دانەیی کێن؟!

یا رب این شمع دل‌افروز ز کاشانه‌ی کیست

جان ما سوخت بپرسید که جانانه‌ی کیست

حالیا خانه برانداز دل و دین من است

تا در آغوش که می‌خسبد و هم‌خانه‌ی کیست

باده‌ی لعل لبش کز لب من دور مباد

راح روح که و پیمان‌ده پیمانه‌ی کیست

دولت صحبت آن شمع سعادت پرتو

بازپرسید خدا را که به پروانه‌ی کیست

می‌دهد هر کسش افسونی و معلوم نشد

که دل نازک او مایل افسانه‌ی کیست

یا رب آن شاهوش ماه رخ زهره جبین

در یکتای که و گوهر یکدانه‌ی کیست

گفتم آه از دل دیوانه‌ی حافظ بی تو

زیر لب خنده‌زنان گفت که دیوانه‌ی کیست

حەوتەییێکی چووە مانگی من و یەکسالّی پڕە
دلّ لە هیجرانی دەنالّێ وەکو شمشالّی زڕە

جامی کولّمی کە گلێنەی رەشی دوو دیدەمی دا
بەگومانم شەوی رەشخالّە لە قەدپالّی گڕە

گەرچی مندالّن و بۆی شیری ئەچۆڕێت لە دەم
دلّ لە پەیکانی موژۆلّی خەتەر و زالّی، پڕە

کەرەمی حاتەمی ئەم شارە بە نێو بانگە، بەلاّم
بۆ غەریبان لە هەموو لایە دەلّێی سالّی قڕە

جەوهەری فەردی دەمی ئێوە دەلیلێکە دەلّێ
مونکیری جەوهەری وا مێشکی لە زووخالّی سڕە

موژدەیان داوە دەچێ بۆ سەفەر و لێرەوە دێ
ئۆغری خێرە! بە سەرفی دلّی عەودالّ و وڕە

قورسە هەلّگرتنی کێوی غەمی دووری بە کەسێ
مل وەکوو تالّە دەزوو، دلّ وەکو بێژنگی شڕە

مل کەچی بەختی رەشی خۆم و شکۆی قاری ئەوم
هەر کە«کۆلیل»ـە لە کۆی جەوری خەتوخالّی خڕە

ماهم این هفته برون رفت و به چشمم سالی‌ست

حال هجران تو چه دانی که چه مشکل حالی‌ست

مردم دیده ز لطف رخ او در رخ او

عکس خود دید گمان برد که مشکین خالی‌ست

می‌چکد شیر هنوز از لب همچون شکرش

گرچه در شیوه گری هر مژه‌اش قتالی‌ست

ای که انگشت نمایی به کرم در همه شهر

وه که در کار غریبان عجبت اهمالی‌ست

بعد از اینم نبود شابه در جوهر فرد

که دهان تو در این نکته خوش استدلالی‌ست

مژده دادند که بر ما گذری خواهی کرد

نیت خیر مگردان که مبارک فالی‌ست

کوه اندوه فراقت به چه حالت بکشد

حافظ خسته که از ناله تنش چون نالی‌ست

کێ بێ کە لە پێچ و خەمی دوو زولفی ڕەشا نین
ئەو حەڵقە لە دەور و بەری کێ داوی بەلا نین
چاوت کە فریوی دڵی هەر گۆشەنشینە
شوێن کەوتنی تاوانی من و شێخ و مەلا نین
جامێکە خودایی بە یەقین ڕوومەتی ڕوونت
ئەلحەق وەکو جامی غەزەلم خلتی تیا نین
نێرگز وەکو چاوت دەیەوێ ساحیر و مەس بێ
دیدە و سەری بەو هۆیەوە ژیر و بە حەیا نین
تۆخوا ئەدی ئەو زولفە مەقرتێنە بە میقرازا!
نالینی دڵم شەو نییە چنگاوشی با نین
تاریکە دەروونم وەرە بنوێنە شەمی ڕووت!
بێ ئێوە کە لەم کۆڕی حەریفانە سەفا نین
سەربەرزییە تیماری غەریبان لە کن ئێمە
ئەم ڕەسمە لە نێو ئێوە مەگەر گیانە ڕەوا نین
پێم وت کە دەچوو دوێنە عەسر جوانە وەفا کە
فەرمووی کە هەڵەت کرد ئەمە خۆ عەسری وەفا نین
سەد پیری موغان ڕێبەری دڵ بێ وەکو تۆ وام
خالی نییە هەرچی سەرە بێ‌سیرڕی خودا نین
بۆ سەرزەنشی خەنجەری چاوت دڵە نیشان
ڕۆستەم سپەری بۆ خەتەری تیری قەزا نین
میحرابە لە بۆ زاهید و سۆفی خەمی ئەبرۆت
کێ بێ کە لە گۆشەی خەمی تۆ دەس بە دوعا نین
ئەی پەنجە بە خوێنی دڵی «حافز» گوڵی ئەتڵەس
شەرمت لە خودا، غیرەتی قورئان، چییە لا نین
«کۆلیل»ی دەس و تێغتە سەر تا بە قەدەم دڵ
شمشێری ئەتۆ لایەقی هەر بێ‌سەر و پا نین

کس نیست که افتاده‌ی آن زلف دوتا نیست
در رهگذر کیست که دامی ز بلا نیست

چون چشم تو دل می‌برد از گوشه‌نشینان
همراه تو بودن گنه از جانب ما نیست

روی تو مگر آینه‌ی لطف الهی‌ست
حقا که چنین است و در این روی و ریا نیست

نرگس طلبد شیوه‌ی چشم تو زهی چشم
مسکین خبرش از سر و در دیده حیا نیست

از بهر خدا زلف مپیرای که ما را
شب نیست که صد عربده با باد صبا نیست

بازآی که بی روی تو ای شمع دل‌افروز
در بزم حریفان اثر نور و صفا نیست

تیمار غریبان اثر ذکر جمیل است
جانا مگر این قاعده در شهر شما نیست

دی می‌شد و گفتم صنما عهد به جای آر
گفتا غلطی خواجه در این عهد وفا نیست

گر پیر مغان مرشد من شد چه تفاوت
در هیچ سری نیست که سری ز خدا نیست

عاشق چه کند گر نکشد بار ملامت
با هیچ دلاور سپر تیر قضا نیست

در صومعه‌ی زاهد و در خلوت صوفی
جز گوشه‌ی ابروی تو محراب دعا نیست

ای چنگ فروبرده به خون دل حافظ
فکرت مگر از غیرت قرآن و خدا نیست

هەر بە رووی ئێـوە نەبێ خەڵکی دییـەم وازر نیـن
غەیـری تۆی تیـا نییـە دڵ چونکە لە تۆ چـاتر نیـن
وا لە ئیحـرامی تەوافـولقەدەمت سەیـلی سـرشـك
هەرچەن ئاوێتـە بە خوێنـی جگـەرە و تاهیـر نیـن
گـیان هەتـا عـەرش بە باڵـێ بفـڕێ باڵێ دەکەم
ئەو مەلی وەحشییـە گەر بـۆ قەفـەست حـازر نیـن
عاشـقی رووتم و قەلبی لە مسم پێشکەشی رووت
کیسـە خـاڵی بە نیسـاری زەڕ و زێـو قـادر نین
بەژنی سەروت دەسی ئاخـر بەدەس ئێنێت کەسێ
کـە وچـانی نیـیە لـە شـوێنت و خـۆڕاگر نین
دەم نەدەم چاکـە لە ئەنفاسی دەم و لێوی مەسێـح
کە لە گیانـدانەوە وەك لەعـلی ئەتـۆ ماهیـر نین
من لە کوورەی گڕی عەشقت قڕوقەپ شاکر هەم
کامـە ناکەس وتـی بـەو داغـەوە دڵ شـاکر نین
هەر هەوەڵ زولفـی پەرێشـانی ئەتـۆم دیت، وتـم
کـە پەرێشـانیـی ئـەم خێڵـە قەتـی ئـاخـر نین
کامە دڵ وەك دڵی «حافـز» نیـیە کۆلیـلی ئەتـۆ
کێ سـەری خاتـری ئێـوەی لە دڵا خاتـر نین
نووری روخساری گەشت رووگەیی«کۆلیل»ـەو بەس
سـوژدەبەر لەو گڕە گەر گـاورە، کێ گاور نین؟!

مـردم دیـده‌ی مـا جــز به رخت ناظــر نیسـت

دل ســر گشتـه‌ی مـا غیــر تـو را ذاکــر نیست

اشکــم احــرام طــواف حـرمــت می‌بنـــدد

گــرچه از خـون دل ریـش دمـی طاهر نیست

بستـــه دام و قفــس بـاد چـو مـــرغ وحشـی

طایـــر ســدره اگر در طلبــت طایـــر نیست

عاشـق مفلس اگــر قلــب دلـش کـرد نثـــار

مکنش عیـب کـه بـر نقــد روان قــادر نیست

عاقبــت دست بــدان سـرو بلنـــدش برسـد

هر کـه را در طلبـت همـت او قــاصـــر نیست

از روان بخشـی عیسـی نزنـم دم هـــر گــز

زان که در روح‌فـزایی چـو لبت ماهــر نیست

من کـه در آتـش ســودای تـو آهـی نزنـم

کـی تـوان گفـت که بر داغ دلـم صـابر نیست

روز اول کـه ســر زلـف تو دیـــدم گفتـــم

که پریشـــانی این سلســـله را آخـــر نیسـت

ســـر پیـوند تو تنـــها نه دل حافــظ راســـت

کیســت آن کش سر پیوند تو در خاطـر نیست

چـون رووالـەت‌بیـنە زاهیـد عـاشق و شەیدا نییە
با بجـاوێ گۆشتـی مـردوو چی دەڕێسـێ وا نییە

خێـرە بۆ ئەهلی تەریقـەت هەر شتێکی بێتە پێش
ئەم شـەقامە هەرکەسێ بگرێ لە ڕێ گومـڕا نییە

شا، روخی سووتـا بە ئاخـی ناخـی سەربازی گەرووم
خۆ هەمـوو کەس شـارەزا بۆ کیش‌ومـاتی شا نییە

پێـم بڵێن ئەم میچـە بەرزەی پڕ گوڵ و سـاکارە چین
چۆنـە وا بەم رازە لەم دونیـا کەسێ زانـا نیـیە

خـوایە هەر تۆ بێ‌نیـاز و قـادری، وەسفـی چییە
بۆ برینـی سەختی ئـەم خەڵکـەت دەوایـێ وا نییە

خـاوەنی دیوانمـان مێشکـی حیسـابی پێ نیـیە
مۆرەکـەی ئارمـی فـریـوە، دڵ بە مـۆری خوا نییە

هەرکە دێ رەببی بەخێـرێ! چی دەوێ بێژن بڵێت
پـەردەدار و نـازی دەرگـاوان لە ئـەم دەرگـا نیـیە

کێ لە دەرکی ئەرکی مەیخانانە، یەک‌ڕەنگە و حەریف
مەیفـرۆشێ وەزنی سووکـی خۆفرۆشی لا نیـیە

قـامەتی ئێمـەن درێـژ و قـۆل و بێـفڕمن، دەنـا
قـەت خەڵاتـی ئێـوە بۆ بەژنی کەسـێ کۆتـا نییە

خۆم غوڵامی پیـری مەیخـانەم کە لوتفی دائیمـە
لوتفـی شێـخ و زاهیـد ئاخـر گا هەیە و گاگا نیـیە

هیممـەت و تەبعی بڵێنـدم پێـیە ژوورم بۆ چیـیە
بـادە نۆشێ عـاشقـم «حافـز»! زەڕم سـەودا نییە

پێت بڵێ نێو بانگی «کۆلیل»ـت لەبەر چی دەرچووە
چونکە عوودی عەشقـی ئەو شـەو سووتنـی بێـجا نییە

زاهد ظاهرپرست از حال ما آگاه نیست
در حق ما هرچه گوید جای هیچ اکراه نیست
در طریقت هر چه پیش سالک آید خیر اوست
در صراط مستقیم ای دل کسی گمراه نیست
تا چه بازی رخ نماید بیدقی خواهیم راند
عرصه‌ی شطرنج رندان را مجال شاه نیست
چیست این سقف بلند ساده‌ی بسیار نقش
زین معما هیچ دانا در جهان آگاه نیست
این چه استغناست یا رب وین چه قادر حکمت است
کاین همه زخم نهان هست و مجال آه نیست
صاحب دیوان ما گویی نمی‌داند حساب
کاندر این طغرا نشان حسبة لله نیست
هر که خواهد گو بیا و هرچه خواهد گو بگو
کبر و ناز و حاجب و دربان بدین درگاه نیست
بر در میخانه رفتن کار یک‌رنگان بود
خودفروشان را به کوی می فروشان راه نیست
هرچه هست از قامت ناساز بی‌اندام ماست
ور نه تشریف تو بر بالای کس کوتاه نیست
بنده‌ی پیر خراباتم که لطفش دایم است
ور نه لطف شیخ و زاهد گاه هست و گاه نیست
حافظ ار بر صدر ننشیند ز عالی‌مشربی‌ست
عاشق دردی‌کش اندر بند مال و جاه نیست

دەشتـــی ئەویــن بەرینــە لە بەندی کنـارە نیـن
ئەم دەشتــە غەیری گۆڕی گەلی دڵپەژارە نین

پیـرۆزە هەر دەقێقە کە دەسپێری دڵ بە عەشـق
ئەم کـارە خێـرە، زوو بە! دەمی ئیستخـارە نیـن

ســاقی شەراب تێکە، بە لۆمەی عەقـڵ نەگەی!
چــون لەم وڵاتی سەرمــە عەقـڵ هیچ کـارە نین

بەو چاوە مەستە بێژە کە خوێنڕێژی ئێمە کێن
ئازیزا! جورمی هەرکەس، لە نەحسی هەسارە نین

هەر حەققی چــاوی پاکە، ببینێ هیـــلالی تۆ
هــەر چـــاو، چـاوی دیتــنی ئەو ماهوارە نین

شێوەی ژیانی رەندی لەبـەر بگـرە چونکـە ئەم
سامــانە سەربەمــۆرە بە رەنـــدان غــەوارە نین

نەیبوو گرین و شیـوەنی «حافــز» لە تۆ ئەسەر
کەمتـر دڵەت لە نەسڵ و بەرەی بەردەهــارە نین

«کۆلیــل»! کێ بە سیـــنە شـل و نەرمە، دڵڕەقە
شیـرینە هەرکە چەشنی روتەب، وایە، چارە نین

راهی‌ست راه عشق که هیچش کناره نیست
آن‌جا جز آن‌که جان بسپارند چاره نیست
هر گه که دل به عشق دهی خوش دمی بود
در کار خیر حاجت هیچ استخاره نیست
ما را ز منع عقل مترسان و می بیار
کان شحنه در ولایت ما هیچ‌کاره نیست
از چشم خود بپرس که ما را که می‌کشد
جانا گناه طالع و جرم ستاره نیست
او را به چشم پاک توان دید چون هلال
هر دیده جای جلوه‌ی آن ماه‌پاره نیست
فرصت شمر طریقه‌ی رندی که این نشان
چون راه گنج بر همه کس آشکاره نیست
نگرفت در تو گریه‌ی حافظ به هیچ رو
حیران آن دلم که کم از سنگ خاره نیست

عەشقی رووی ئێـوە لـە مـاڵی نەزەرێ نیـن کە نیـن
خاکـی رێگـەت کلی چـاوی بەشەرێ نین کە نین
خەڵکی دڵ سـەیری شـەمی روومـەتی رەخشانت ئەکا
رازی پەنهـانی کەزێـکەت لە سـەرێ نیـن کە نیـن
ئەشکی من سـووره بە هـۆی فیتنەگـەری زار و خەجڵ
سـەر بەرەو ژێـری عەمەڵ، خوێنجگەرێ نین کە نین
نەک لـە داوێنـی بنیشێ، بە نەسیمـۆ گـەردێ
پڕ لـە سێـڵاوی دیـەم رێـگوزەرێ نین کە نین
تـا لـە هـەر جێـگە لە زولفی رەشـی تۆ بـاس نەبـێ
وتووێـژی من و شـەوبا، سەحـەرێ نیـن کە نین
من لـەبـەر بەختـی رەشی خۆمـە دەسووتێـم دەنـا
لوتفـی تۆ دەرهـەقی هەر دەربـەدەرێ، نیـن کە نیـن
لە مەترسـی دەمـی شیـرینتە ئەی کەوسـەری ژیـن
نوقمـی ئـاوی شـەرم ئەوڕۆ، شەکـەرێ نین کە نین
شەقڵـی نەشـکاوە قسـە و باسـی دڵـم گەرچی لە لای
کـۆڕی رەندان و حەریفـان، خەبـەرێ نین کە نین
لەو بیـاوانە ئەویـن راوییـە، کەروێشکـە پڵینـگ
وەی لە ئـەم رێگـە کە جێـگەی خەتـەرێ نین کە نین
چاو منەتبـاری کلـەی خاکـی دەری تۆیە کـە وا
تـاسـەخۆری دیـەکەم خـاکی دەرێ نیـن کە نین
هەر ئەوەی ماوە لەشـم بێنییـە گوێزێکـەوە سووک
چونکە جێـژوانی غەم و هەر کەسـەرێ نین کە نین
گەرچی «حافز» لە دەست خوێن لە دڵێ، خۆم و خودام
هەر لە سەر تـا قەدەمت هەر هـونەرێ نیـن کە نیـن
سەروی «کۆلیـل»ـی و ئازادییـە بـارە و سەمـەرت
عـاشقـی بەرهـەمی تـۆ دەربـەدەرێ نیـن کە نیـن

روشـــن از پرتــو رویت نظـری نیست کـه نیست

منت خـــاک درت بر بصــری نیست کـه نیست

نـاظـــــر روی تـو صـــاحب نظـــراننـــد آری

سر گیسـوی تو در هیـچ سـری نیست که نیست

اشک غمـــاز من ار ســرخ برآمـــد چه عجب

خجـل از کردهی خود پردهدری نیست که نیست

تـــا بـــه دامـــن ننشینـــد ز نسیمـــش گـــردی

سیـــل خیز از نظــرم رهگذری نیست که نیست

تا دم از شـــام ســــر زلف تو هر جـــا نزننـــد

با صبــا گفت و شنیــدم سحری نیست که نیست

مـن از این طـــالع شـــوریده بـرنجـــم ور نـی

بهـــرهمند از سر کــویت دگری نیست که نیست

از حیـــای لـب شیـــرین تـو ای چشمـهی نـوش

غـــرق آب و عرق اکنون شکری نیست که نیست

مصلحـــت نیسـت کـه از پـــرده بـــرون افتـــد راز

ور نه در مجلس رنـــدان خبـــری نیست که نیست

شیـــر در بـــادیهی عشـــق تـــو روبـــاه شـــود

آه از این راه که در وی خطـــری نیست که نیست

آب چشمـــــم که بر او منـــت خـــاک درتوست

زیر صـــد منت او خـــاک دری نیست که نیست

از وجـــودم قـــدری نـام و نشـان هست که هست

ور نه از ضعـف در آنجـــا اثری نیست که نیست

غیـــر از این نکتـــه که حافـظ ز تو ناخشنـود است

در ســـراپای وجـــودت هنـــری نیـست که نیست

بەرهەمی بوون و خولی تۆپی زەمان ئەونە نییە
زوو بە مەی بێنە! کە بڕیاری جەهان ئەونە نییە
گیان و دڵ بۆیە درا پێشکەشی گیانان بکرێ
چونکە خاڵی لەمە، روتبەی دڵ و گیان ئەونە نییە
سێبەری سیدرە و تووبا، لە سەرت بێ بە منەت
ژێری ئەو سایە مەچۆ سەروی رەوان! ئەونە نییە
ناز و نیعمەت چییە گەر خوێنی دڵ وگیانی دەوێ
دڵ نەبێ نرخی گوڵ و باخی جەنان، ئەونە نییە
کورتە چون ژینت و مەودا نییە دڵ شا بە دەمێ!
ئەسپی غەم زین مەکە! مەیدانی ژیان ئەونە نییە
ساقیا فرسەتە تۆفانی ئەجەل وا لە کەمین
تێکە مەی! دەرفەتی لێو تا بە زمان ئەونە نییە
خیرەتی حەق لە ریا تووڕەیە زاهید بە سەرت
خانەقا بەینی هەتا دەیری موغان ئەونە نییە
روومەتی زەرد و تەلایی هونەری دەردی دڵە
بە رواڵەت ئەسەری شەرح و بەیان ئەونە نییە
ناوی چاکەی چووە «حافز» بە هەموو لایە بەڵام
رەندە ئەو، دەربەسی قازانج و زیان ئەونە نییە
خۆشە رسوایی «کۆلیل» بە هۆی عەشقی نیگار
شۆرەتی شیعر و غەزەڵ، نام و نیشان، ئەونە نییە

حاصل کارگه کون و مکان این همه نیست
باده پیش آر که اسباب جهان این همه نیست

از دل و جان شرف صحبت جانان غرض است
غرض این است وگرنه دل و جان این همه نیست

منت سدره و طوبی ز پی سایه مکش
که چو خوش بنگری ای سرو روان این همه نیست

دولت آن است که بی خون دل آید به کنار
ور نه با سعی و عمل باغ جنان این همه نیست

پنج روزی که در این مرحله مهلت داری
خوش بیاسای زمانی که زمان این همه نیست

بر لب بحر فنا منتظریم ای ساقی
فرصتی دان که ز لب تا به دهان این همه نیست

زاهد ایمن مشو از بازی غیرت زنهار
که ره از صومعه تا دیر مغان این همه نیست

دردمندی من سوخته زار و نزار
ظاهراً حاجت تقریر و بیان این همه نیست

نام حافظ رقم نیک پذیرفت ولی
پیش رندان رقم سود و زیان این همه نیست

خــەوی ئەو نێــرگزە قەتــرانتــە بێشــت نیــیە خۆ
پێچی ئەو پەرچەمــە پەخشــانتــە بێشــت نیــیە خۆ
دەتکــا شیــر لە ئەو لێــوە، وتوومــانە کــە ئـــەم
شــەکری دەورانــی نمەکدانتــە، بێشت نیــیە خۆ
پڕ تەمــەن بیــت! دەزانم کــە لــە نێــو قەوسـی بـرۆ
تیــری ئەو نەشتــەری موژگــانتە بێشت نیــیە خۆ
تێکـــڵاوی بە غەمـی دووری و قەیـرانی فیـــراق
ئەی دڵ! ئەم شیــوەن و گریـانتــە بێشت نیــیە خۆ
دوێنەشەو سروە لە کۆی یارەوە گوڵزاری هەژانـد
ئەی گوڵ! ئەو یێخــە دڕینــانتــە بێشت نییە خۆ
دڵ دەشــارێتەوە گەرچی غەمی عەشقـی لەم و لەو
«حافــز» ئەم ڕێــژنەیی چــاوانتــە بێشت نیــیە خۆ
دیدە تاریکــە لە دین هەر وەکـو «کۆلیـل» ئەڵێت
تیشکـی ئەو روومــەتە رەخشــانتە بێشت نیــیە خۆ

خواب آن نرگس فتان تو بی چیزی نیست

تاب آن زلف پریشان تو بی چیزی نیست

از لبت شیر روان بود که من می گفتم

این شکر گرد نمکدان تو بی چیزی نیست

جان درازی تو بادا که یقین می‌دانم

در کمان ناوك مژگان تو بی چیزی نیست

مبتلایی به غم محنت و اندوه فراق

ای دل این ناله و افغان تو بی چیزی نیست

دوش باد از سر کویش به گلستان بگذشت

ای گل این چاك گریبان تو بی چیزی نیست

درد عشق ار چه دل از خلق نهان می‌دارد

حافظ این دیده‌ی گریان تو بی چیزی نیست

سەرای ئێوە نەبێ بۆ سەرم سەرایێ نین
لە عالەما مەگەرم دەرکی تۆ پەنایێ نین

کە دژ، بە تێغەوە هەڵمەت ئەدا، سپەر نادەم
کە تێغی ئێمە مەگەر ناڵە ناڵ و وایێ نین

چلۆن لە مەیکەدە روو وەربگێرم ئاخر بۆ؟
کە چاترم لە جەهان هیچ داب و رایێ نین

زەمانە ئاگر ئەدا گەر لە خەرمەنی ژینم
گرینگ بۆ ئەوە، بۆ من پرووشە کایێ نین

غولامی نێرگزی پڕ سیحری ئەو بەژن سەوزەم
هەر ئەونە مەستە کە هیچی بە کەس نیگایێ نین

بە مەیلی خۆ بکە بەو مەرجە کەس نەڕەنجێنی
بە شەرعی ئێمە کە سەر لەم گونا گونایێ نین

رەمۆک وا مەبە ئەی حاکمی وڵاتی جەماڵ!
کە نەبوە رێگەنشینێ کە بۆ رجایێ نین

بە هەر تەرەف کە دەبینم لە رێگەما داوە
لە پێچی زولفی رەشی چاترم پەنایێ نین

ئەوینی دڵ مەدە «حافز»! بە هەر خەت و خاڵێ
کە کاری دڵبەری ئاخر بە هەر سیایێ نین

لە سیحری چاوی دەمەق ما، سەری گەلێ زانا
«عومەر» بە ساحیری وا سەر بدا خەتایێ نین

جز آستان توأم در جهان پناهی نیست

سر مرا بجز این در حواله گاهی نیست

عدو چو تیغ کشد من سپر بیندازم

که تیغ ما بجز از ناله‌ای و آهی نیست

چرا ز کوی خرابات روی برتابم

کزین به هم به جهان هیچ رسم و راهی نیست

زمانه گر بزند آتشم به خرمن عمر

بگو بسوز که بر من به برگ کاهی نیست

غلام نرگس جمّاش آن سهی سروم

که از شراب غرورش به کس نگاهی نیست

مباش در پی آزار و هرچه خواهی کن

که در شریعت ما غیر از این گناهی نیست

عنان کشیده رو ای پادشاه کشور حسن

که نیست بر سر راهی که دادخواهی نیست

چنین که از همه سو دام راه می‌بینم

به از حمایت زلفش مرا پناهی نیست

خزینه‌ی دل حافظ به زلف و خال مده

که کارهای چنین حد هر سیاهی نیست

بولبولێ بەرگی گولێکی ئاڵ و کاڵی بوو لە زار

دەم لەگەڵ یارا لە نێو دەم بوو کەچی گریان و زار

پێم وت ئاخر خۆ بە کامی دڵ گەیشتی، ناڵە چین؟

پێی وتم بۆ حەزرەتی یارە و گڕوی شەوقی دیار

گەر بە من رازی نەبوو تەشریفی چوو چارم چییە

ئەو کە سوڵتانی بەهارە و عارە خۆی بێنێتە خوار

کەی نیاز و نازی من کەی؟ هاوترازی روی گوڵە

خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی دڵگیرە لا هەستی نیگار

سا وەرن! با خۆ بەقوربانی هونەرمەندێ بکەین

سووڕی پەڕگارێکی، ئەم نەخش و نیگارەی خستە کار

رێڕەوی پیری ئەوین ترسی لە رسوایی نییە

شێخی سەنعان خەرقە دەفرۆشێ بە جامی چاوی یار

کاتی ئەو دەروێشە شیرین کاتە شیرین بێ! کە پاک

وەک مەلەک هەر یار یاری بوو لە نێو خێڵی نەیار

ئاوی چاوی «حافز»ی عاشق لە کۆشکی دڵبەرا

عەینی ئەو چۆمەی لە ژێر باخی بەهەشتا دێتە خوار

عادەتی بەختم وەها بوو قەت لەگەڵما را نەیێ

چۆن دەگا «کۆلیل»ـی پێخاوس بە ئێوەی شاسوار؟

بلبلی برگ گلی خوش‌رنگ در منقار داشت
ونـدر آن برگ و نـوا خوش نالـه‌های زار داشت

گفتمش در عین وصل این ناله و فریاد چیست
گفت ما را جلوه‌ی معشوق در این کار داشت

یار اگر ننشست با ما نیست جای اعتراض
پادشاهی کامران بود از گدایی عار داشت

در نمی‌گیرد نیاز و ناز ما با حسن دوست
خرم آن کز نازنینان بخت برخوردار داشت

خیز تا بر کلک آن نقاش جان افشان کنیم
کاین همه نقش عجب در گردش پرگار داشت

گر مرید راه عشقی فکر بدنامی مکن
شیخ صنعان خرقه رهن خانه‌ی خمار داشت

وقت آن شیرین قلندر خوش که در اطوار سیر
ذکر تسبیح ملک در حلقه‌ی زنار داشت

چشم حافظ زیر بام قصر آن حوری سرشت
شیوه‌ی جِنّات تَجری تَحتِها الأنهار داشت

ئادیتــە یــار قـەستی مەگـەر هـەر ستــەم نەبوو

عەهدی شکــان و بۆ غەمی ئێمەیشی غـەم نەبوو

لێی مەگرە خوایە گەرچی سـەری کۆتـری دڵی

هەڵکەند و حورمەتێکی بە تەیری حەرەم نەبوو

بەختی نەیاری خۆمە جەفــاکارە وەرنە یــار

حاشــای قەت لە داب و نەرێتـی کەرەم نەبــوو

بەم حاڵەشۆ ئەوەی کە نەبێ مەست و پەستی ئەو

هەر جێگە چوو لە چاوی کەسێ موحتەرەم نەبوو

مەیگێـــڕ بــادە بێــنە بە دارۆغــــە بێــژە بــا

بەرگر نەبێ! کە جــامیجەمـی وایە جــەم نەبوو

سۆفــی کە رێی نەبـردە حەریمــی جەنــابی تۆ

چی چۆڵــی ئەو هەژارە بڕی هەر حەرەم نەبوو

بڕفێنــە گۆی بەیـان و غـەزەڵ! «حافز»ا ڕەقیـب

نەك هــەر هونـەر نەدارە خــەبەردار هەم نەبوو

ســاقی شەراب تێــکە! نە بۆ موددەعی، کە ئـەو

«کۆلیل»و شێتی پێچی خەمی زولفی شەم نەبوو

دیـدی که یـار جز سر جور و ستم نداشت

بشکست عهد و ز غـم ما هیچ غـــم نداشت

یا رب مگیــرش ارچـه دل چـون کبوتـــرم

افکنـــد و کشت و عزت صیـد حرم نداشت

بـر مـن جفـــا ز بخت من آمـد وگـرنه یـار

حاشـا که رسم لطـف و طـریق کرم نداشت

با این همه هر آن که نه خواری کشید از او

هر جـا که رفت هیچ کسش محترم نداشت

ســـاقی بیـــار بـاده و بـا محتسـب بگـو

انکـــار ما مکـن که چنین جام جم نداشت

هــر راهــرو که ره به حـــریـم درش نبـــرد

مسکـین برید وادی و ره در حـــرم نداشت

حافــظ ببر تو گـوی فصــاحت که مدعـــی

هیچـــش هنر نبـــود و خبـــر نیز هم نداشت

شنەی نەسیمی بەهەشتی کە دێ لە دەشتی بەهـــار
من و هەتـاوی مەی و چـاوی پڕ لـە نـازی نیگـار
هـــەژار چـۆنی نەبێ مـــافی سەڵتـەنەت ئەوڕۆ
لە ژووری خێـوەتی هەورەو لە ژێری فەرشی بەهار
بە باخی جەننـــەتی نادەم بەهەشتــی نەغدێ ژیـان
چەمـەن حەکـایەتی مانگـی گوڵانی سـەوزە لە زار
دڵ ئـاوەدان کە بە مـەی! چون جەهانی کـاوڵبـوو
گەرەکیە خاکـــی سـەر و پێ بکـا بە خشتی تەلار
لـە دژ وەفـا مەکــــە داوا! کــە ڕۆشنـــــی نـــادا
شەمـی کـەنێسـە، بە مزگــــەوتی دڵ لە شــــەوار
مەلامەتی منی مـەس، کەی ڕەوا بە تۆمـــــەتی تۆن
بە کـێ درا خەبـەری سەرنویشت و دەسخەتی یار؟
بچۆ لەگـەڵ لەشـی بێ گیـانی «خاجە» تا قەبـــران
کە ئەهلی جەننــەتە هەرچەن گونـاحی زۆرە هەژار
خەتــای بێ حـەدی «کۆلیـــــل» ناگەیێ بە عەتــای
دەلالـی ئێمە، کە چەشنی بەهـارە بۆ گوڵ و خـــار

کنـــون که می‌دمـد از بوستان نسیـم بهشت

من و شراب فرح بخش و یـار حـور سرشت

گـــدا چــــرا نـزنــد لاف سلطنـــت امـروز

که خیمه سایه‌ی ابر است و بزمگه لب کشت

چمــن حکــایت اردیبهــشت می گـــــوید

نه عاقـل است که نسیـه خرید و نقـد بهشت

به می عمارت دل کن که این جهان خراب

بر آن سر است که از خاک ما بسازد خشت

وفــا مجوی ز دشمـن که پرتـوی ندهـــد

چو شمـع صومعه افروزی از چـراغ کنشت

مکــن به نامـه سیــاهی ملامــت من مســت

که آگه است که تقدیر بر سرش چه نوشت

قـــدم دریـغ مــدار از جنـــازه‌ی حافـــظ

که گرچه غرق گناه است می‌رود به بهشت

پاکبــازی ئەگە ســۆفی! زەمی رەنــدان چەپەڵە

تۆ بەهەشتی بە! جەحــانم بەشی گەنـد و دەغــەڵە

ئێوە چا بن من ئەگەر سوك و چرووك و گەنەڵم

دەغــڵ و خەرمــانی فـەلا بەرهەمی تۆوی هەوەڵە

هەرکەسێ عاشقـی یـارە لە هەموو شوێنێ و مەقــام

چ لـە مـزگــەوت و کلیســا، چ بــزان و چ هەڵــە

ســەری دڵ سـوژدەبەری خشتی دەری مەیکەدەیە

تێــنەگا بێـت و رەقیب ئەم وتـە، مێشکـی پفــەڵە

لە سـەرم دەرمەکە هیــوا بە شنـەی لوتفی قەدیــم

تۆ کـە بێزەینـی مەڵێ کێ پەرییـە و کێ چەقـەڵە

نە خەتــاباری هەوەڵ منـــم و نە ئــەو تۆڵــەگرە

لـەم لەدەســـدان و بە دەســـکەوتنە، بابــم ئەوەڵە

«حافــز»! رۆژی مەرگێ جـامە شەرابێ خەیە دەس

لـە خەرابــاتەوە دەتبــاتە بەهەشــت ئەو عەمـەڵە

بـا بڵێــم کــامـە بەهەشتـی دڵـی «کۆلیــل»ـی منـە

بەژن و چــاوی کـەژەڵ و عەتـر و بەهار و غەزەڵە

عیب رندان مکن ای زاهد پاکیزه سرشت

که گناه دگران بر تو نخواهند نوشت

من اگر نیکم و گر بد، تو برو خود را باش

هر کسی آن درود عاقبت کار که کشت

همه کس طالب یارند چه هشیار و چه مست

همه جا خانه‌ی عشق است چه مسجد چه کنشت

سر تسلیم من و خشت در میکده‌ها

مدعی گر نکند فهم سخن گو سر و خشت

ناامیدم مکن از سابقه‌ی لطف ازل

تو پس پرده چه دانی که که خوب است و که زشت

نه من از پرده‌ی تقوا به در افتادم و بس

پدرم نیز بهشت ابد از دست بهشت

حافظا روز اجل گر به کف آری جامی

یکسر از کوی خرابات برندت به بهشت

بولبولێ سوورە گوڵێکی لە سەحەر وا دەدووان

نـاز مەفرۆشە! بە ئەم باخە دەڵێن باخی ژووان

پێکەنی گوڵ وتی هەروایە کە فەرمووت، بەڵام

کامە عاشق بە قسەی تاڵی وەها یاری دووان؟!

تا لە مل کیژی مژۆڵت نەکەی ئەسرێنی شەوەق

دەس لە مل کیژی رەز و ماچی بزەی لەعلی کووان؟

تا قیامەت نەچەشێ بۆنی هەناسەی گوڵی ناز!

هەرکە خۆڵی دەری مەیخانە نەلێسێ بە زووان

چوومە نێو باخی ئیرەم دوێنەشەوێ دیم کە لەوێ

سومبول و زولفی لەگەڵ سروە یەکێکن نە دووان

پێموت ئەی پەیکی جەم و تەختی! سولەیمان لە کوێن؟

سەد مغابن وتی ئەم چەرخە ئەوانیشی چووان

ئەم قسەو باستە ساقی بەسە، بۆم تێکە شەراب!

واعیز ئەورۆ لە وتارا گڕی عەشقی دەنووان

نوقمی ئەسرینییە سەبر و خیرەدی «حافز»ی زار

بەحری سووری بووە دژمن گوڵی ئەسراری رووان

خۆش لەگەڵ مێگەلی عەشقی دڵی ناشادییە شێخ

بۆیە «کۆلیل» بە دڵ بۆ غەمی تۆ بوو بە شووان

صبحدم مرغ چمن با گل نوخاسته گفت
ناز کم کن که در این باغ بسی چون تو شکفت
گل بخندید که از راست نرنجیم ولی
هیچ عاشق سخن سخت به معشوق نگفت
گر طمع داری از آن جام مرصع می لعل
ای بسا دُر که به نوک مژه‌ات باید سُفت
تا ابد بوی محبت به مشامش نرسد
هر که خاک در میخانه به رخساره نرفت
در گلستان ارم دوش چو از لطف هوا
زلف سنبل به نسیم سحری می‌آشفت
گفتم ای مسند جم جام جهان بینت کو
گفت افسوس که آن دولت بیدار بخفت
سخن عشق نه آن است که آید به زبان
ساقیا می ده و کوتاه کن این گفت و شنفت
اشک حافظ خرد و صبر به دریا انداخت
چه کند سوز غم عشق نیارست نهفت

ئەو شۆخی پەری روومەتە چی بوو کە وەها چوو

ئاخۆ کە خەتای ئێمە بو یا ئەو بە خەتا چوو؟

بیلبیلەیی دوو دیدە هەتا چوو لە نەزەرما

بۆم نایە بلێم چاوی سەرم چی بەسەرا چوو

دوێشەو بە دڵی شەم نەچو بەو سۆزی دەروونەی

ئەو دووکەڵ و سووتانە بە ناخی جیگەرا چوو

پەرژین لە روخی ئێوە، لە رۆخی چەمی(سیروان)

لێلاوی سرشکم وەکو تۆفانی فەنا چوو

کەوتوومەتە جێ تا غەمی دووریتە لە گیانم

مردم لەبەر ئەم دەردە، لە دەس چارە دەوا چوو

تا سەر وتی دۆعا بکە دڵ بێتەوە گاهەس

عومرێکە کە عومرم سەروکاری بە دوعا چوو

رووگەی دڵی حاجی چووە، ئیحرامی چ پۆشین

بۆ مەروە هەڕاکردنی چیمانە؟! سەفا چوو

دوکتور کە دەسی نا لە دڵم دوێ وتی سەد حەیف

ئەم دەردە دڵەی ئێوە لە قانوونی شفا چوو

«حافز» بە تەما ما، قەدەمێ هەڵگرە بۆ لای

ها وەختە خەبەر بێ کە بەرەو ماڵی بەقا چوو

چون عاقیبەتی مردنە «کۆلیل»! هەموو کەس

خۆزگەم بە کەسێ سەر بە غەمی عەهد و وەفا چوو

آن ترک پری چهره که دوش از بر ما رفت
آیـا چه خطـا دید کـه از راه خطـا رفت

تـا رفت مرا از نظـر آن چشم جهـان‌بیـن
کس واقف ما نیست که از دیده چه‌ها رفت

بـر شمـع نرفـت از گـذر آتـش دل دوش
آن دود که از سوز جگـر بر سـر مـا رفت

دور از رخ تـو دم بـه دم از گوشه‌ی چشمم
سیـلاب سـرشک آمـد و طوفـان بلا رفت

از پـای فتـادیم چو آمـد غـم هجـران
در درد بمـردیـم چو از دسـت دوا رفت

دل گفت وصـالش به دعـا باز تـوان یافت
عمـری‌ست که عمرم همه در کار دعا رفت

احـرام چه بندیـم چو آن قبـله نه اینجـاست
در سعـی چه کوشیم چو از مروه صفـا رفت

دی گفت طبیب از سر حسـرت چو مرا دید
هیهـات که رنج تو ز قـانون شفـا رفت

ای دوسـت به پرسیـدن حافـظ قدمـی نـه
زان پیـش که گوینـد که از دار فنـا رفت

گەر لە دەستی خـالّی میشکینت خەتـایێ بوون، بـوون
یـا لـە جـەوری زولفی پڕچینـت جەفـایێ بوون، بوون

عەشق ئەگەر خەرمـانی هەستـیشم بسـووتێـنێ چ بوو
جـەوری سولّتـانی دەرون گەر بۆ گەدایێ بوون، بوون

مـن وەفـاداری ئەوینـی بێ غـەل و خەوشـی ئەتـۆم
جامــەکەت بێنـا جەفـاکانت سەفـایێ بوون، بوون

کێـوی سـەبـرن دڵ لـە ژێـر بـاری گـرانی ئێـوەدا
گــەر مەلوولـت کردبێ یـا هـەر گونـایێ بوون، بوون

یـا ئەگــەر لـەرزی غەمی نـازت هەڵـیچۆقـانـدوم
یا لــە نێـوانی «مـەم» و «زیـن»دا هــەرایێ بوون، بوون

ناحــەزان هەرچەنــدە بەینــێ بەینــی شێـوانین بەڵام
گـەر لـە کــۆڕی ئێمـە یــاران نـاڕەوایێ بوون، بوون

عەیبی «حافـز» با نەڵێ واعیـز لە مزگــەوتێ کە چوو
دڵ نەچێـری راوی ئـەو زووتـر کــە رایێ بوون، بوون

گۆچی شێری خیرەت و عەشقم وەکوو «کۆلیل» ئەڵێم:
مەشقی ترس و قین لە گوێـمـا سووکە بـایێ بوون، بوون

گر ز دست زلف مشکینت خطایی رفت رفت

ور ز هندوی شما بر ما جفایی رفت رفت

برق عشق ار خرمن پشمینه‌پوشی سوخت سوخت

جور شاه کامران گر بر گدایی رفت رفت

در طریقت رنجش خاطر نباشد می بیار

هر کدورت را که بینی چون صفایی رفت رفت

عشق‌بازی را تحمل باید ای دل پای دار

گر ملالی بود بود و گر خطایی رفت رفت

گر دلی از غمزه‌ی دلدار باری برد برد

ور میان جان و جانان ماجرایی رفت رفت

از سخن‌چینان ملالت‌ها پدید آمد ولی

گر میان همنشینان ناسزایی رفت رفت

عیب حافظ گو مکن واعظ که رفت از خانقاه

پای آزادی چه بندی گر به جایی رفت رفت

ساقی شەراب تێکە! کە مانگی (سیام) چوو
جامم دەیێ کە دەرفەتی خێڵی عەوام چوو
چون کات خۆشەویسە وەرن تۆڵە کەینەوە
عومرێ کە بێ کەنین و بزەی لێوی جام چوو
بەو شێوە سەرخۆشم کە نەزانم بە کۆی خەیاڵ
کێ هات نێوەڕۆژ و دەمە و شام کام چوو
بەڵکوو بگا بە دەستی دڵم، جامی هەستی تۆ
شەو تا سەحەر لە مەیکەدە تیری رجام چوو
دڵ مردبوو دوبارە ژیانی لەبەر کرا
تا بۆی نەسیمی بادە بە گیانی مەشام چوو
زاهید بەهۆی ریا بو سلامەت نەچوو بە رێ
زانا لەبەر نیازی بە (دارالسلام) چوو
نەغدی دڵم نەدا بە شەرابی حەلاڵی یار
رووکەش بو زێڕی ئێمە کەوا بۆ حەرام چوو
تا کەی بە سۆزی تۆبە بسووتم لە گوێنی عوود
مەی بێنە! چون تەمەن بە خەیالاتی خام چوو
سا بەس بکەن نەسیحەتی «حافز» کە چۆڵە رێ
لەو گومبووەی شەرابی مورادی بەکام چوو
سۆفی وتی «عومەر»! وەرە بۆ خانەقا، وتم
بۆ چوونی تۆ نەچووم و حەزی خانەقام چوو

ســاقی بیــار بــاده کـه مـاه صیــام رفت

در ده قــدح که موســم نامـوس و نـام رفت

وقـت عزیــز رفت بیــا تـا قضــا کنیــم

عمری که بی حضـور صراحی و جـام رفت

مستم کن آن‌چنــان که ندانــم ز بیخـودی

در عرصـه‌ی خیــال که آمـد کـــدام رفت

بر بــوی آن که جرعــه‌ی جامت به ما رسد

در مصطبه دعــای تو هـر صبح و شـام رفت

دل را که مـرده بود حیــاتی به جــان رسید

تـا بـویی از نسیـم مــی‌اش در مشــام رفت

زاهـــد غـــرور داشــت ســلامت نبـرد راه

رنـــد از ره نیـــاز بـه دارالســـلام رفت

نقـــد دلـی که بود مـرا صـــرف بــاده شـد

قلـــب سیـــاه بـود از آن در حـــرام رفــت

در تـاب توبه چند توان سوخت همچو عود

می ده که عمــر در سر سـودای خــام رفت

دیگـر مکـن نصیحـت حافــظ که ره نیافت

گمـگشتــه‌ای که بـاده‌ی نابش به کـام رفت

نەمچەشی حەیف شەرابێ لە گوڵی زاری و چوو

نەبو دڵ پڕ لە دیاری شەمی روخساری و چوو

لەگەڵ ئێمەی وەکو بێژی فرە دژوارە ژیان

تۆزی پایم نەشکان، بەستی بنە و باری و چوو

فاتیحە و زیکری یەمانیم بە ئیخلاسەوە خوێند

بەڵکو تەشریفی نەچێ هیچ نەبوو چاری و چوو

فێڵی لێ کردم ئەوەی پێمی دەوت لێرەوە دێ

دیتە چۆن کەوتمە نێو داوی فریوکاری و چوو؟!

ئەو لە نێو باخی جەمالا دەگەڕا و ئێمە لە دوی

نەیچنی کەس گوڵە ماچێك لە گوڵزاری و چوو

چەشنی «حافز» گ شەوێ شیوەن و زاریمە کە حەیف

نەگەیشتم بە وەداعی، منی زاماری و چوو

سەر وتی سەبرە دەوا بۆ دڵی «کۆلیل»، کەچی

دڵ وتی سەر نییە حاڵی لە ئەوینداری و چوو

شربتی از لب لعلش نچشیدیم و برفت
روی مه پیکر او سیر ندیدیم و برفت

گویی از صحبت ما نیک به تنگ آمده بود
بار بربست و به گردش نرسیدیم و برفت

بس که ما فاتحه و حرز یمانی خواندیم
وز پی‌اش سوره‌ی اخلاص دمیدیم و برفت

عشوه دادند که بر ما گذری خواهی کرد
دیدی آخر که چنین عشوه خریدیم و برفت

شد چمان در چمن حسن و لطافت لیکن
در گلستان وصالش نچمیدیم و برفت

همچو حافظ همه شب ناله و زاری کردیم
کای دریغا به وداعش نرسیدیم و برفت

مەیگێــڕ مــوژدە بێ کە ئـەوین کوڵـمی خستـە دەر
شەوقی شـەمی لە خەڵـوەتی یــارانــە شوعلــەوەر
ئەو مۆمـە سەرکـــراوە گـڕێ خۆش‌تری نــوواند
ئـەم پیـــرە هــانە ڕەنگی شـــەواری درا بەسەر
نــازی وەهــا بە موفتی نیشــاندا لە خشتــە چوو
لوتفـی بە دۆس ئەوەن بو کە دژ ترســی کەوتە بەر
هەیهــەی لە ئەو عیبــارەتە سیحــراوییــەی دەمت!
یەک پستـە چۆن کـراوە بە کـانی قــەن و شەکـەر
باری غەمێ کە خـاتری ئێمــەی شەکـەت ئەکرد
عیســـادەمێ گەیشـت و غــەمی دەرپــەڕانە دەر
ئەو قـامەتەی کە نازی لە سـەر مانگ و خۆر ئەکرد
تــا دیتــی بەژنــی ئێــوە سـەری شـەرمی خستە بەر
ئـەم عەشقـە چەرخی حەوگـومەزی پڕ لە ناڵە کرد
ساویلکـە کـورت بیـنە کە گــرتوویە موختــەسەر
سیحـری بەیــان لە کێوە بە «حافز» درا کە بەخت
وەک چــاوەزار شیــعری ئەوی گـرتە بەرگی زەڕ
چـــاوی سەحـەر کە روونە وەکوو بەختی دڵبەران
مۆمی شکـۆی بەیـانی غەزەڵبێژی وەک «عومەر»

ساقی بیا که یار ز رخ پرده برگرفت
کار چراغ خلوتیان باز درگرفت
آن شمع سرگرفته دگر چهره برفروخت
وین پیر سالخورده جوانی ز سر گرفت
آن عشوه داد عشق که مفتی ز ره برفت
وان لطف کرد دوست که دشمن حذر گرفت
زنهار از آن عبارت شیرین دل‌فریب
گویی که پسته‌ی تو سخن در شکر گرفت
بار غمی که خاطر ما خسته کرده بود
عیسی دمی خدا بفرستاد و برگرفت
هر سروقد که بر مه و خور حسن می‌فروخت
چون تو درآمدی پی کاری دگر گرفت
زین قصه هفت گنبد افلاک پرصداست
کوته نظر ببین که سخن مختصر گرفت
حافظ تو این سخن ز که آموختی که بخت
تعویذ کرد شعر تو را و به زر گرفت

پەیمانی کولم و لێوی شرینت جەهانی گرت
وەک یەکیەتی ولاتی لە دەس دژمنانی گرت
شەم ویستی رازی خەلوەنشینان بلێ بەلام
شوکری خودا زمانی قسەی لالمانی گرت
ئەو ئاگرەی نهێنە لە ئەم سینە، خۆر فەقیەت
یەک ژیلەمۆ پزیسکە کە حەو ئاسمانی گرت
تا خونچە ویستی لافی دەمت لێ‌بدا، سەبا
خوستی بڕی کە خستی بە مستێ دووانی گرت
پەرگاری دڵ لە دەور و خولی خۆ، لە غەم کەنار
دەوران بە جەغزی خست و بە نوختەی میانی گرت
ئەو رۆژە شەوقی بادە دلی سووت و خەرمەنم
وا گرشەیێ لە کولمی گەروی جامەکانی گرت
هەر ئەومە چاکە پێخە تەکان بچمە مەیکەدە
چون گەرد و خاکی فیتنە سەراپا زەمانی گرت
مەی خۆ! کە هەرکە ژین و سەرەنجامی کاری دی
سووکێ لە غەم دەرات و لە کووپەی گرانی گرت
بەرگی گوڵان بە خوێنی شەقایەق شەلاڵ و سوور
هەرکەس کە ژیرە، جامی وەکوو ئەرخەوانی گرت
ئاوی ژیانە «خاجە»! دەچۆڕێ لە شیعری تۆ
گیانی حەسوودە عەیبی لە چەشمەی رەوانی گرت
«کۆلیل» بەرقی نەزمی سەحەر گرتە چ باخێ؟
بێ‌شک بە عەشقی ئێوە لە باخی بەیانی گرت

حسنت به اتفاق ملاحت جهان گرفت
آری به اتفاق جهان می‌توان گرفت

افشای راز خلوتیان خواست کرد شمع
شکر خدا که سر دلش در زبان گرفت

زین آتش نهفته که در سینه‌ی من است
خورشید شعله‌ای‌ست که در آسمان گرفت

می‌خواست گل که دم زند از رنگ و بوی دوست
از غیرت صبا نفسش در دهان گرفت

آسوده بر کنار چو پرگار می‌شدم
دوران چو نقطه‌ی عاقبتم در میان گرفت

آن روز شوق ساغر می خرمنم بسوخت
کآتش ز عکس عارض ساقی در آن گرفت

خواهم شدن به کوی مغان آستین فشان
زین فتنه‌ها که دامن آخر زمان گرفت

می خور که هر که آخر کار جهان بدید
از غم سبک برآمد و رطل گران گرفت

بر برگ گل به خون شقایق نوشته‌اند
کان کس که پخته شد می چون ارغوان گرفت

حافظ چو آب لطف ز نظم تو می‌چکد
حاسد چگونه نکته تواند بر آن گرفت

قسەی خۆشێکە کە ئێژن لە پیری کەنعانە
«فەراقی یار ئەوە ناکا کە بێژم ئاوانە»
مەلا لە خۆفی قیامەت کە باس ئەکا مەبەسی
دەروونی عاشق و شەوگاری سەختی هیجرانە
سوئالی دلبەری کۆچەر لە کێ بکەم دیسان
لە شەرحی چونکە سەبا چەشنی من پەرێشانە
لە دەستی ئەو گولە بێ رەحمە وەی! کە عەهدی شکان
فوغان کە تەرکی رەفیقانی بۆ چەن ئاسانە
گەلێ دەکەم لەمە بەولا سپاسی جەوری رەقیب
دلم کە عادەتی دەردە و لە تەرکی دەرمانە
شەرابی کۆنە مەگەر لابەرێ غەمی کۆنم
کە تۆوی خۆشدلی جووتێر ئەلێ لە پەیمانە
گرێ لە با مەدە! با کامەران و بەختەوەری
کە ئەم کەلامە قسەی با لەگەڵ سولەیمانە
بە مۆلەتێ کە فەلەک دایەتی لە خشتە مەچۆ
مەگەر کەسێ وتی ئەم زاڵە دەس لە وەستانە
مەتەق لە خزمەتی دلبەر دەبێ نەکەی عاشق!
کە بەختی تۆ بە دڵ وگیان لە گفتی گیانانە
لە کوێنە؟ کێ وتی «حافز» لە سۆزی ئێوە نەما
ئەمن وتوومە؟ نە! هەرکەس وتوویە بوختانە
ئەگەر شەوێ شەمی «کۆلیل» گوڵ بکا بێشک
زەلانی فیتنە شەوێکی وەها لە جەولانە

شنیده‌ام سخنی خوش که پیر کنعان گفت

فراق یار نه آن می‌کند که بتوان گفت

حدیث هول قیامت که گفت واعظ شهر

کنایتی‌ست که از روزگار هجران گفت

نشان یار سفرکرده از که پرسم باز

که هرچه گفت برید صبا پریشان گفت

فغان که آن مه نامهربان مهرگسل

به ترک صحبت یاران خود چه آسان گفت

من و مقام رضا بعد از این و شکر رقیب

که دل به درد تو خو کرد و ترک درمان گفت

غم کهن به می سالخورده دفع کنید

که تخم خوشدلی این است پیر دهقان گفت

گره به باد مزن گرچه بر مراد رود

که این سخن به مثل باد با سلیمان گفت

به مهلتی که سپهرت دهد ز راه مرو

تو را که گفت که این زال ترک دستان گفت

مزن ز چون و چرا دم که بنده‌ی مقبل

قبول کرد به جان هر سخن که جانان گفت

که گفت حافظ از اندیشه‌ی تو آمد باز

من این نگفته‌ام آن کس که گفت بهتان گفت

یارەب لە سەفەر بێتەوە دلبەر بە سەلامەت!
فریام کەوێ کوشتمی زیندانی مەلامەت
خاکی سەرەڕێی عەشقی سەفەرکەردە کە بێنن
دوو بیلبیلەم ئامادەیە بۆ کۆشکی ئیقامەت
هاوار لە هەر شەش تەرەفۆ رێ دەبەسنێ لێم
خاڵی رەش و روو، بەژن و خەت و زولف و شەمامەت
تا ماوە حەیاتم کەرەمێ چاکە ئەگینا
بۆ چیمە کە مردم شەتی ئەسرینی نەدامەت
تەفسیری ئەوین مردنە بۆ یار نە دەمدان
وەک یەک نییە فرمێسکی غەم و ئەشکی هەلامەت
عاشق نییەتی ناڵە لە شمشێری عەزیزان
بەم عێلە دەبێ کوشتە بدا حەققی غەرامەت
ئەو دەڵقی ریا فڕ دە! کە ساقی خەمی ئەبرۆی
سەندی لە مەلا تاقەتی میحراب و ئیمامەت
حاشا کە بناڵم لە دەس ئەو جەور و جەفاتە
بێدادی هەموو لوتفە گوڵی خۆش قەد و قامەت
کورتی مەکە «حافز» غەزەلی زولفی درێژی
ئەو رشتەیە پەیوەندە هەتا رۆژی قیامەت
«کۆلیل» کە رسوا سەری زولفت بووە چی بوو
رسوائییە بۆ عاشقی بێخەوش عەلامەت

یا رب سببی ساز که یارم به سلامت

باز آید و برهاندم از بند ملامت

خاک ره آن یار سفر کرده بیارید

تا چشم جهان‌بین کنمش جای اقامت

فریاد که از شش جهتم راه ببستند

آن خال و خط و زلف و رخ و عارض و قامت

امروز که در دست توأم مرحمتی کن

فردا که شوم خاک چه سود اشک ندامت

ای آن که به تقریر و بیان دم زنی از عشق

ما با تو نداریم سخن خیر و سلامت

درویش مکن ناله ز شمشیر احبا

کاین طایفه از کشته ستانند غرامت

در خرقه زن آتش که خم ابروی ساقی

بر می‌شکند گوشه‌ی محراب امامت

حاشا که من از جور و جفای تو بنالم

بیداد لطیفان همه لطف است و کرامت

کوته نکند بحث سر زلف تو حافظ

پیوسته شد این سلسله تا روز قیامت

ئەی ســروە بۆ دەلالی ســەباتان بـەڕێ دەکـەم
بڕوانە چۆن بە باخی سەفـاتان بەڕێ دەکـــەم
نابێ مەلێ وەک ئێوە لە ژێر بـاڵی غەم سـەری
دڵـخۆش بە بۆ لیـانی وەفاتــان بەڕێ دەکــەم
دوور و نزیکی بۆ نییە ڕێگـــەی ئەوین، ئەمنـە
دەتبیـــنم ئاشکـــار و دوعــاتـان بــەڕێ دەکەم
هـەر سوبح و شەو سپایێ موناجـات و چاوەزار
هاوڕێ لەگەڵ شەمـاڵ و سەباتان بەڕێ دەکەم
وێــرانی تــا نەکردووە هێـــزی غەمت وجوود
ئازیــزا! دڵ بە لوتفـی پەنــاتان بەڕێ دەکـــەم
ئەی ئەو کەســەی لە دیدە ون و حازری لە دڵ
پڕ گـوڵ هـەزار دەشتـی سەنـاتان بەڕێ دەکەم
سەیرانگـــەی خوداییـــە بڕوا بەهـــاری ڕووت
جامــی خـودانووێنـــی خوداتـان بەڕێ دەکەم
موتریـب هەتــا لە سۆزی دڵـم بۆت بڵـێ هـەوا
شیـعر و غەزەڵ بە ساز و نەواتان بەڕێ دەکەم
مەیگێـڕ بێـنە بـــادە لـە غەیبـم خەبــەر درا
دەردی ئەوین بکێـشە! دەواتــان بەڕێ دەکەم
«حافــز» نەوای کۆڕی مە، یـادی بەخێری تۆن
زووتر وەرن کە ئەسپ و کەواتان بەڕێ دەکەم
«کۆلیل»! حەققی خۆتە خەلاتی حوزووری یار
بۆ پێشـــوازی ئێـــوە هـومـــاتـان بەڕێ دەکەم

ای هدهد صبا به سبا می‌فرستمت

بنگر که از کجا به کجا می‌فرستمت

حیف است طایری چو تو در خاکدان غم

زین‌جا به آشیان وفا می‌فرستمت

در راه عشق مرحله‌ی قرب و بعد نیست

می‌بینمت عیان و دعا می‌فرستمت

هر صبح و شام قافله‌ای از دعای خیر

در صحبت شمال و صبا می‌فرستمت

تا لشکر غمت نکند ملک دل خراب

جان عزیز خود به نوا می‌فرستمت

ای غایب از نظر که شدی همنشین دل

می‌گویمت دعا و ثنا می‌فرستمت

در روی خود تفرج صنع خدای کن

کآیینه‌ی خدای نما می‌فرستمت

تا مطربان ز شوق منت آگهی دهند

قول و غزل به ساز و نوا می‌فرستمت

ساقی بیا که هاتف غیبم به مژده گفت

با درد صبر کن که دوا می‌فرستمت

حافظ سرود مجلس ما ذکر خیر توست

بشتاب هان که اسب و قبا می‌فرستمت

ئەی گوم لە خەڵکی دیدە خودا ئاگەداری تۆم
سووتاوە گیانم ئەرچی، بە دڵ بێقەراری تۆم
داوێنی یار شەرتە لە دەس بەر نەدەم هەریز
داوێن سپی هەتاکوو بە گۆڕی گڵین دەڕۆم
دەستی دوعا دەکەم لە ملت تا سەحەر ئەگەر
بنوێنی رووگە واتە خەمی تاقی دوو بڕۆم
هاڕووتی بابلیش ئەگەرم یاوەری بکات
دەتخەم بەدەس بەسیحر و بەسۆزی(غەریو مەڕۆ)م
دڵ چاوەڕێیە گیانی بکا پێشکەشت، وەرە
ئەی بێوەفا تەبیبی دەرون! هەر برین بەسۆم
ئاودێری باخی بەژنتە سەد جۆگە ئەشکی چاو
سا تۆش گیانە! تووی حەزێکت بەڕێ کە بۆم
سەد ئافەرین لە خەنجەری نازت کە خوێنمی
رشت و دەرون حەساوە لە دەس عەشقی بێمهۆم
دەگریم هەتا لە گوێنی سرشکم لە سینەتان
گوڵزاری خۆشەویستی بچێنم بە کەیفی خۆم
روخسەت کەرەم کە دیدە! هەتا دڵ پەسا پەسا
داکا لە لەعلی سووری وەکوو چۆمی تانجەرۆم
«حافز»! شەراب و عەشق و جووانی تەواو بوو
تێفکرە چۆن دەسووتی ئەمێستەش بە چەشنی مۆم
«کۆلیل»و تەرکی تورکی گلارت مەحاڵە، چون
(کەرکووک)ی ئارەزوومی غەمت کوفرە بۆ نەخۆم

ای غایب از نظر به خدا می‌سپارمت

جانم بسوختی و به دل دوست دارمت

تا دامن کفن نکشم زیر پای خاک

باور مکن که دست ز دامن بدارمت

محراب ابرویت بنما تا سحرگهی

دست دعا برآرم و در گردن آرمت

گر بایدم شدن سوی هاروت بابلی

صد گونه جادویی بکنم تا بیارمت

خواهم که پیش میرمت ای بی‌وفا طبیب

بیمار بازپرس که در انتظارمت

صد جوی آب بسته‌ام از دیده بر کنار

بر بوی تخم مهر که در دل بکارمت

خونم بریخت و از غم عشقم خلاص داد

منت‌پذیر غمزه‌ی خنجر گذارمت

می‌گریم و مرادم از این سیل اشکبار

تخم محبت است که در دل بکارمت

بارم ده از کرم سوی خود تا به سوز دل

در پای دم به دم گهر از دیده بارمت

حافظ شراب و شاهد و رندی نه وضع توست

فی‌الجمله می‌کنی و فرو می‌گذارمت

میـرەکەم چەن خـۆش ئەچـی حـەیـرانی بـالاّتم بە دڵ
خۆم بە سەر گــەردی خەرامـانی، سـەراپـاتـم بە دڵ
دوێنـە فەرمووتـانە کەی دەمـری لە بەر پێمـا؟ دەمێ
تـۆ تەقـــازا کـەی، ئەمـن مـردوی تەقـــازاتـم بە دڵ
عـــاشقێکـی نیــوە مەست و دوورە دەستـم ساقیــا!
من کە کوشتـەی لارولەنجـەی سـەروی ئـازاتم بە دڵ
گـەر دەپرسـی چۆنە عومـرێکە نەخۆشی؟ چـاوەکـەم
چونکـە تامـەزرۆ بە سـەیـری چـاوی شەهلاتم بە دڵ
لەعلـی لێـوت دەرد و دەرمـانم وەکوو فەرمووتە پێـم
دەردی تـۆ ئـاواتی مـن، شێـتی مـوداواتـم بـە دڵ
چـەن بە نـاز و راز ئەڕۆی ئەی چاوی پیست لێ بە دوور
دڵ بە خۆزگـەو سەر بە عەشقی خـاکی ژێر پاتم بە دڵ
خەڵـوەتی وەسڵـت ئەگەرچـی قسمـەتی «حـافز» نەبوو
ئەی سـەراپا دڵـڕفێن هـەر شێـت و شەیـداتـم بە دڵ
عەینی «کۆلیل»ـم وەکوو شەونم لە حاسی خۆری رووت
چـاو لە هالاّوی بەتیـن و تونـدی گەرمـاتم بە دڵ

میـــر من خوش می‌روی کـاندر سر و پا میـرمت

خوش خـــرامان شو که پیش قـد رعـــنا میــرمت

گفته بودی کی بمیـری پیش من تعجیـل چیست

خوش تقــاضا می‌کنـی پیــش تقاضــا میـــرمت

عاشق و مخمور و مهجـورم بت ساقی کجاست

گـو که بخـــرامد که پیش ســـرو بالا میـــرمت

آن کـه عمــری شد که تا بیمــارم از سـودای او

گو نگــاهی کن که پیــش چشم شهـلا میـــرمت

گفتــه لعــل لبــم هـــم درد بخشــد هـــم دوا

گـــاه پیــش درد و گـــه پیــش مداوا میـــرمت

خوش خرامان می‌روی چشـم بد از روی تو دور

دارم انـــدر سر خیـــال آن کـــه در پـــا میـــرمت

گرچه جـای حافظ اندر خلوت وصـــل تو نیست

ای همـــه جای تو خـوش پیش همه جا میـــرمت

چ گەورە مەرحەمەتێ بوو لە جەوهەری قەڵەمت

كە حەققی خزمەتی ئێمەی نووانە كۆی كەرەمت

لە سەردەمی قەڵەمت خۆش رەقەم كراوە سڵاو

بە مۆری چەرخی بەرین بێ! هەتا هەتا رەقەمت

مەحاڵە یاد لە ئەم بێ‌دڵەت خەتا بۆوبێت

عەقڵ دەڵێ نییە عەیبێ لە خاترەی قەڵەمت

لە دەركی حورمەتی خۆتم وەدەر مەنێ! كاتێ

غوڵامە دەوڵەتی تا سەر لە ئەركی موحتەرەمت

بەڵێن ئەدەم بە سەری پەرچەمت گوڵم وەرە لام

كە تا سەرم نەبڕی هەڵنەسم لە ژێر قەدەمت

لە دەردی ئێمە دڵت تێدەگا بەلامە دەمێ

كە لالە شینە لە گۆڕی شەهیدەكانی غەمت

قومێ خەڵات كە تەنیا بە گیانی تینوومان

كە ئاوی ژینە تنۆكێ لە لوتفی جامی جەمت

كە گیانی دڵشەكەتی «حافز»ت ژیاوە وتم

سەبا بژیت بە خۆشی كە وەك مەسیحە دەمت

شەماڵ و سروە لە «كۆلیل» زیزن ئازیزم

وتوویە چون وەكو موشكی تەتارە زولفی خەمت

هەتـا هەتـاوی شـــەرابێ لە کۆی پییـــاڵە بە دەر دێ

لە بـــاخی روومـــەتی ســاقی قەتـاری لالـە بە دەر دێ

شەمیــمی پەرچەمی سومبــول لە مێرگولاّن دەخەوێ تا

نەسیمی یاسەمـــەنی زولفــی ئەو منـــاڵە خەبـــەر دێ

شکـایەتی شـــەوی دووری نە ئەو حەکـایەتە کورتـەن

کە هەر کەمــێ لە بەیـانی بە سـەد ریسـاڵە بە سەر دێ

کە سەر بە ژێرە فەلەك سفرە گردەکەی، بە تەمـا نیـم

کە بێخەفـــەت لـەتـە نانـێ بکـا حەواڵـــە بە مەردێ

بە هەوڵی خۆ نییە دەسکەوتی لەعل و گەوهەری ئاوات

خەیـــاڵە هەرکە بلـێ بـــاخ بێقـــەواڵە وە بەر دێ

بە چەشنی نـووح لە تۆفـانی غـەم سەبوورە ئەگـەر دڵ

بەلا دەچێـت و ژیـانی هـــەزار ســـاڵـــە بە بـەر دێ

کە عەتری پەرچـــەمی تۆ روو بکا لە مەرقــەدی «حافـز»

لە خـــاکی گـــۆڕی هـــەزاران هـــەزار ژاڵە وەدەر دێ

«عومــەر» خەیاڵی شەوی زولفتی لە سەر جەمە پەوکێ

زوخــاوی رەش لە دەروونی بە ئـاهـ و نالـەوە هەر دێ

چو آفتــاب مـی از مشــرق پیــاله بــرآید

ز بــاغ عـارض ســاقی هــزار لاله بــرآید

نسیــم در ســر گل بشکنــد کلاله‌ی سنبـل

چو از میــان چمـن بوی آن کــلاله بــرآید

حکایت شب هجران نه آن حکایت حالی‌ست

که شمــه‌ای ز بیــانش به صد رساله بــرآید

ز گرد خــوان نگون فلک طمع نتوان داشت

که بی ملالت صــد غصــه یک نوالـه بــرآید

به سعی خود نتــوان برد پی به گوهـر مقصود

خیــال باشد کــاین کار بی‌حوالـه بــرآید

گرت چو نوح نبی صبر هست در غــم طوفان

بــلا بگردد و کــام هـــزارســاله بــرآید

نسیــم زلف تو چون بگــذرد به تربت حافظ

ز خاک کالبــدش صد هــزار لاله بــرآید

چەنێ موبـــارەکە کـــاتێ کە یـــارەکەم بێـــتۆ
به کەیفـــی گیانی غەمین غەمگوسارەکەم بێـــتۆ

دییەم وەک ئەسپی بەڵەک تاو ئەدەم بەرەو یادی
بە ئـەو ئومێـــدە کە زوو شاسووارەکەم بێـــتۆ

سەرێ بە گۆی سەری زولفی نەبێ، دەڵێم یارەب
لە تەن جـودا ســەرە پـووچ و نەیارەکەم بێـــتۆ

بە چەشنی خاک لە ســەر رێگــەیا کەمینم گرت
بە ئـەو هــەوایە لەوێـــڕا نیگـــارەکـەم بێـــتۆ

دڵێ لەگەڵ ســەری دوو زولفـی تۆ قــەراری بێ
مەحـــاڵە بەو دڵــە هەرگیز قــەرارەکەم بێـــتۆ

جەفـــا لە بولبـــولی عاشـــق دەچێ، لە بەفرانبـــار
کە پڕ سەفـــا گوڵی باخـــی بەهـــارەکەم بێـــتۆ

رجـامە «خاجە»! لە لوتفی قــەزا، دەس و نەخشی،
کە قـــامەتی وەکـو ســەروی دڵارەکەم بێـــتۆ

خومارە سەر وەکـو «کۆلیل» و دڵ دەمی بە دوعا
کە ســەوڵقامەت و نێـرگز خومـــارەکەم بێـــتۆ

زهی خجسته زمانی که یار بازآید
به کام غمزدگان غمگسار بازآید
به پیش خیل خیالش کشیدم ابلق چشم
بدان امید که آن شهسوار بازآید
اگر نه در خم چوگان او رود سر من
ز سر نگویم و سر خود چه کار بازآید
مقیم بر سر راهش نشسته‌ام چون گرد
بدان هوس که بدین رهگذار بازآید
دلی که با سر زلفین او قراری داد
گمان مبر که بدان دل قرار بازآید
چه جورها که کشیدند بلبلان از دی
به بوی آن که دگر نوبهار بازآید
ز نقش بند قضا هست امید آن حافظ
که همچو سرو به دستم نگار بازآید

ئۆخـەی ئەو پـاك سرشتەم لە سـەفەر دێتـەوە باز
شــەوی تاریك بە هێــلانەیی ســەر دێتـەوە باز

هەمــە هیــوا بە سرشكـی وەكـو بــارانم، ئەدی
بەرقـی چـاوی شلّــەقاوم بە نـەزەر دێتـەوە باز

ئەو كەسەی تاجی سەرم بوو، گلّ و خاكی بەری پێی
لە خـوداوەنـدمە داوا كـە بـە ســەر دێتـەوە باز

هەر بە دوویــا دەگەڕێــم و خەبــەرێكم كە نەبوو
خۆ لە مەرگی لەشی ڕێبــوار خەبــەر دێتـەوە باز

گەوهەری گیــان كە بە پۆیلــەی قەدەمی یـار نەبێ
بۆ چمن رۆحی وەهـا سووك ئەگەر دێتـەوە باز؟

تەپلّی شـایی دەكوتم شەرتە لە ســەر بانی فەلـەك
تـا ببیــنم لە سەفــەر قورسی قەمــەر دێتـەوە باز

خـەوی شیــرینی سوحـانە و دەمی نەی بەرگری بوو
بژنـەوێ سۆزی سەحەرخێــزم ئەگەر، دێتـەوە باز

«حافــز»! ئاواتی مە دیـداری گوڵی روومەتی شـان
مــەدەدێ تـا بـە سلامــەت بە دەوەر دێتـەوە باز

دەولّەتی دلّ چـووە پێشـوازی گولّ و خۆشـە دلّی
بەو قەرارەی كە بە كۆی سینگی «عومەر» دێتەوە باز

اگر آن طایر قدسی ز درم بازآید

عمر بگذشته به پیرانه سرم بازآید

دارم امید بر این اشک چو باران که دگر

برق دولت که برفت از نظرم بازآید

آن‌که تاج سر من خاک کف پایش بود

از خدا می‌طلبم تا به سرم بازآید

خواهم اندر عقبش رفت به یاران عزیز

شخصم ار بازنیاید خبرم بازآید

گر نثار قدم یار گرامی نکنم

گوهر جان به چه‌کار دگرم بازآید

کوس نودولتی از بام سعادت بزنم

گر ببینم که مه نوسفرم بازآید

مانعش غلغل چنگ است و شکرخواب صبوح

ور نه گر بشنود آه سحرم بازآید

آرزومند رخ شاه چو ماهم حافظ

همتی تا به سلامت ز درم بازآید

ئەجـــەل گەیشت و مـــورادی دڵـــم بـە دەر نـایێ
ئەمـــان لە بەختی رەشـــم بۆ لە خەو خـەوەر نـایێ

لە خـــاکی دەرکی ئـەوانی سـەبا لە چـاوم کرد
کە ئـــاوی روونی ژیـــانی وەبـــەر نـەزەر نـایێ

هەتـاکو سـەروی تەڕی قامـەتی لە بـەر نەگرم
نمـــامی بەخـت و مـــورادی دڵـــم بە بـەر نـایێ

مەگـــەر بە هیممـەتی بەژنی بڵێـــندی دڵبەر بێ
دەنــــا کە هیچ کـەسم لوتفـــی کاریگـەر نـایێ

ئەسیـــرە دڵ لەوەتـا خۆش‌نشیـــنی زولفـی تـۆن
لە ئـــەو غەریبـــە بەڵاکێشـــە چی خەبـــەر نـایێ

بە ژێکـــەوانی دوعـــا تیـــرە راســـەکەم نەیگرت
بەڵێ نیشـــانە کە کـەچ بوو لە دڵ هونـــەر نـایێ

گەلێ حەکـــایەتی ســـەر بۆ شنـەی سەحەر وا پێ
وەلێ لە بەختی من ئەوشۆ شوکور سەحـــەر نـایێ

بە هیچ و پووچ بە ســـەر چوو تەمـەن کەچی هێـما
بەڵا لە ســـەر خەمی زولفی رەشت بە ســـەر نـایێ

دڵی فیـــرارییە «حافز» لە ترســـی فێـــڵ و فـــەرەز
کە وا لە جەغـــزی کەزێتـــا ئەمێستـــە دەر نـایێ

بە دیقـی چـــاوی نەیـــاران پەیـــامی‌دا دڵبـــەر
کە کەس بە چاڵی چەنەم پاک وەک «عومەر» نایێ

نفس برآمد و کام از تو بر نمی‌آید

فغان که بخت من از خواب در نمی‌آید

صبا به چشم من انداخت خاکی از کویش

که آب زندگیم در نظر نمی‌آید

قد بلند تو را تا به بر نمی‌گیرم

درخت کام و مرادم به بر نمی‌آید

مگر به روی دلارای یار ما ور نی

به هیچ وجه دگر کار بر نمی‌آید

مقیم زلف تو شد دل که خوش سوادی دید

و زآن غریب بلاکش خبر نمی‌آید

ز شست صدق گشادم هزار تیر دعا

ولی چه سود یکی کارگر نمی‌آید

بسم حکایت دل هست با نسیم سحر

ولی به بخت من امشب سحر نمی‌آید

در این خیال به سر شد زمان عمر و هنوز

بلای زلف سیاهت به سر نمی‌آید

ز بس که شد دل حافظ رمیده از همه‌کس

کنون ز حلقه‌ی زلفت به در نمی‌آید

بـرۆی کەنیشکی جـەژن دەق ئەدا هیلالی جەهـان
هیــلالی یەکشـەوە ئاسـا بە هۆی بـرۆتە چەمـان
چەمیــوە چەشنـی برۆکەت لە حەسـرەتـا پشتــم
ئەوەندە ساوت ئەدا بۆم بە وسمـە، تیـر و کـەوان
مەگـەر نفووسی بە باخـی گوڵان گەیـی نەفـەست
کە گوڵ کراسی لە بـەر دادڕی بە چەشنـی بەیـان
نەبوو خەبـەر لە دەف و نـەی، دەمێ گڵم تێکـەڵ
لەگـەڵ شـەراب کرابوو بە ئەمری پیـری موغـان
بە تۆ دەڵێـم غەمـی دڵـم و مـەرارەتـی، وەرە لام!
حـەرامـە بیستـنی بێ تۆ، حەڵاڵـە لاڵـە زمـان
ئەگـەر سەخاوەتی وەسڵت بە رۆحـە، راحـەتە بۆم
کە نرخـی نـایە مەتـاعی وەهـا، تەنانە بە گیـان
کە مانـگی روومـەتی ئێـوەم ئەدی لە شـامی قـژا
بە رووت رۆشن ئەبوو چەشنی رۆ، شەواری خەمـان
بە لێـو گەیشتووە گیـان و مـورادی دڵ نەگـەیی
نەمـا لە سیـنە ئومێـد و نیـازی ئێمـە هەمـان
لە عەشقـی بەژنـی «حافز» گوتوونە چەن غـەزەلێ
بخوێنە شیعری و وەك دوڕ لەگوێ کە نەزمی ئەوان!
نە زاوری ئەوە دەستێ بـدەم لە پەرچـەمی شـەو
نە قـۆرەتی دڵی «کۆلیـل»ـمن بە تـەرکی شـەوان

جهـــان بر ابروی عیــد از هـلال وسمـه کشید
هــلال عیـــد در ابــروی یـــار بایـــد دید
شکستــه گشت چو پشت هـلال قـــامت من
کمـــان ابروی یـــارم چـو وسمــه باز کشید
مگر نسیــم خطت صبـــح در چمـن بگذشت
که گل به بوی تو بر تن چو صبح جـامه درید
نبــود چنگ و ربــاب و نبــید و عـود که بود
گل وجـــود من آغشتـــه گــلاب و نبـــید
بیـــا که بـا تو بگویـــم غـــم مـــلالت دل
چــرا که بی تو نـــــدارم مجال گفت و شنید
بهـــای وصـــل تو گر جـــان بود خریـــدارم
که جنس خوب مبصـــر به هر چــه دید خرید
چو مـــــاه روی تو در شـــام زلف می‌دیــدم
شبـــم به روی تو روشـــن چو روز می گردید
به لب رسیـــد مرا جـــان و برنیـــامد کـــام
به ســـر رسید امیـــد و طلب به ســـر نرسیـد
ز شـــوق روی تو حافظ نوشت حـــرفی چنـــد
بخوان ز نظمش و در گوش کن چو مرواریـد

لە ئێـوە موژدە! کە نەورۆزە، ژینگە شیـن و شەبـاب
هەموو دەکەن وەکو من مووچە سەرفی جامی شەراب
بڵێـــندە دەنگی مــراوی، بلـووری جـام لە کوێن؟
لە شیـــنە بولبـول ئەڵـێ چۆنـە گـوڵ دڕانی حیجاب
کەســێ هەنـار و شەمـــامەی بتـێ بە دڵ نەمـژێت
چ تـــامی سێـوی بەهەشتـی لە زارە؟ خانـــە خراب
خەتـــایە ئۆف لە ڕێـی دڵبـــەر و مەلامـــەتی یـــار
بە راحەتی نەگـــەیی کەس مەگەر بە ڕەنج و عەزاب
هەتـا لە بـاخی بەهـــاری ڕوواوە خەتتـی بەنـــەوش
گوڵـێ لە ڕوومـــەتی مەیگێـــڕ بگـــرە بیـکە گوڵاب!
وەهـــا کریشمـــەیی ســـاقی دڵـی نـــزارمی بـرد
لەگـــەڵ کەســم چ نەمـــا تاقـــەتی سوئال و جەواب
من ئەو عەبـــایە بە ڕەنگـــی گوڵاڵـــە ئـاور ئەدەم
کە پیـــری مەیکەدە نەیســەن بە یەك پییاڵە شەراب
بەهـــار ڕاگـــرە یاڕەب! خەریکـــە وەختـــی ئەچێ
بە بێ ئەوەی بەشـی «حافـز» لە مـەی بنێـتە حەساب
تەفـاوەتی چییە «کۆلیـل»! ئەرێ بەهـــار و خـــەزان
کە بێـــبەشی لە سوراحی لە دەنگی چەنگ و روبـاب

رسید مژده که آمد بهار و سبزه دمید
وظیفه گر برسد مصرفش گل است و نبید

صفیر مرغ برآمد بط شراب کجاست
فغان فتاد به بلبل نقاب گل که کشید

ز میوه‌های بهشتی چه ذوق دریابد
هر آن‌که سیب زنخدان شاهدی نگزید

مکن ز غصه شکایت که در طریق طلب
به راحتی نرسید آن‌که زحمتی نکشید

ز روی ساقی مهوش گلی بچین امروز
که گرد عارض بستان خط بنفشه دمید

چنان کرشمه‌ی ساقی دلم ز دست ببرد
که با کسی دگرم نیست برگ گفت و شنید

من این مرقع رنگین چو گل بخواهم سوخت
که پیر باده‌فروشش به جرعه‌ای نخرید

بهار می‌گذرد دادگسترا دریاب
که رفت موسم و حافظ هنوز می نچشید

بادی نەورۆزی شنەی دێ پێکەنی هەوری بەهار

حاتەمێکم لازمە بۆ موتریب و جامی هەنار

خۆنووێنن دڵبەران و شەرمەزاری کیسە خۆم

قورسە باری عاشقی بێزەڕ، وەلێ ئازیزە بار

وشکەساڵی هیممەتە و نایێ فرۆشی ئابڕوو

بۆ شەراب و گوڵ دەبێ ئەو خەرقە بفرۆشم لە شار

دەم بە دۆعا بوو شەوی پێشوو سەحەر ئامینی وت

دەوڵەتی بەختم لە خەو هەڵسێ مەگەر وەک چاوی یار

گوڵ بە کوڵمی سوور و لێوی پڕ لە زەردەی هاتە باخ

بیستبووی بۆنی سەخاوەت دێ لە دەستی جۆیبار

چەن کراسێکم لە جنسی پاکپۆشی کۆنەکرد

با لە رەندیشا یەخەی چاکی کراسێ بێتە خوار

ئەو هەموو نوکتەی لە لێوی لەعلی تۆم وت، کێ وتی

کێ لە زولفت دەس‌درێژی دی وەکوو ئێمەی هەزار

بێت و دەرمانی ئەوینداران نەکا وێنووسی عەشق

گۆشەگیران چۆن بژین ئاخۆ لە جەوری رۆژگار

من کە نازانم دڵی «حافز» بە تیری کێوە بوو

هەر ئەوەم زانی دەچۆڕێ خوێن لە شیعری تاسەدار

چاوی تیراوێژتی کێ بوو بە دڵ، «کۆلیل»وار

کێ وەک ئەو بارامە گۆری سینگی کردم کۆڵەوار

ابـــر آذاری بـــر آمد بـــاد نوروزی وزیـــد

وجه مـی می‌خواهم و مطرب که می گوید رسید

شـــاهدان در جلوه و من شرمسـار کیســـه‌ام

بـار عشـق و مفلسـی صعب است می‌باید کشید

قحط جود است آبروی خود نمی‌بـاید فـروخت

بـــاده و گـل از بهـــای خـــرقه می‌باید خرید

گوییـــا خواهد گشـود از دولتم کاری که دوش

من همـــی کردم دعــا و صبح صـــادق می‌دمید

با لبـی و صـــدهزاران خنـــده آمد گـل به بـاغ

از کریمـی گوییـا در گوشـــه‌ای بویی شنیـــد

دامنـی گر چـاک شد در عـــالم رندی چه باک

جامـــه‌ای در نیک‌نـــامی نیـز می‌بـاید دریـــد

این لطـایف کز لب لعل تو من گفتـم که گفت

وین تطـــاول کز سـر زلف تو من دیـدم که دید

عدل سلطـــان گر نپرسـد حال مظلومـــان عشق

گوشه‌گیـــران را ز آســـایش طمع بایـــد برید

تیـــر عاشـــق‌کش ندانـم بر دل حافـــظ که زد

این‌قـــدر دانم که از شعـر ترش خون می‌چکید

هەواڵەکەم! لە حەریفی شەوانە یادێ کە
بەراتی خزمەتی ئەو عاشقانە یادێکە
لە کاتی سەرمەسیا، شەو لە ناڵەناڵی دڵ
بە دەنگی چەنگ و هەواری تەکانە یادێ کە
گزینگی بادە کە هەڵدێ لە روومەتی مەیگێڕ
لە عاشقان بە مەقامێ، شەوانە یادێ کە
کە دەس لە گەردنی هیوا دەکا دڵی ئاوات
لە قەولی خۆت بە من لەو دەمانە یادێ کە
ئەگەرچی مەرکەبی ئیقباڵ توند و سەرکێشە
لە هاوەڵان بە کەرەم، حاتەمانە یادێ کە
کە نیتە هەر غەمی سۆزی دڵی وەفاداران
لە بێوەفایی چەرخی زەمانە یادێ کە
بەلوتف و مەرحەمەت ئەی گەورەکەسی ژوورنشین!
لە عەشقی «خاجە» بە ئەم ئاستانە یادێ کە
چ زەردە کوڵمی «عومەر» چەندە soorە لێوی تۆ
بەهارەکەم بە کەرەم لەو خەزانە یادێ کە

معاشــران ز حــریف شبــانه یــاد آرید

حقــوق بنــدگی مخلصانه یــاد آرید

به وقت ســرخوشی از آه و ناله‌ی عشاق

به صوت و نغمه‌ی چنگ و چغانه یاد آرید

چو لطف بـاده کند جلوه در رخ ســاقی

ز عاشقــان به سرود و ترانـه یــاد آرید

چو در میـــان مراد آورید دست امیـــد

ز عهـــد صحبت ما در میانه یــاد آرید

سمنـــد دولت اگر چند سرکشیـــده رود

ز همــــرهان به ســـر تازیانه یــاد آرید

نمی‌خوریـد زمـانی غـــم وفـــاداران

ز بی‌وفـــایی دور زمـــانه یــاد آرید

به وجه مرحمت ای ساکنان صدر جلال

ز روی حافــظ و این آستانه یــاد آرید

وەرن کە پەرچەمی پیرۆزی شاریار گەیی
هەوالّی فەتحی هەتا چەرخی خۆرهەوار گەیی
جەمالّی بەختی نووانی زەرافەتی زەفەری
کەمالّی عەدلّی، بە هاواری هەر هەژار گەیی
فەلەک ئەمێستە خول ئەخوا بە کەیف، خۆری هەلاّت
جەهان نمامی بەری پێگەیی، کە یار گەیی
زەمانە چۆلە لە نامەرد و رێگری دلّ و دین
مەترسە! قافلەسالار و پیاوی کار گەیی
بە دیقی چاوی براگەل عەزیزی میسرە ئەوین
لە چالّی قوولەوە تا عەرشی کردگار گەیی
لە کوێیە سۆفیی ناڕاس و شێوە کنجی دەغەلّ
بلێ بسووتە! کە مەنسووری دینمەدار گەیی
سەبا بە یار بفەرموو لە سۆزی عەشقی ئەوم
بە دلّ چەنێ گڕی نالّین و تۆفی ژار گەیی
لە شەوقی دیتنت ئەی گولّ بە دلّ لە بەندی فیراق
هەمان گەییوە لە ئاگر کە بۆ پووار گەیی
چ کاتی خەوتنە «حافز»! کە دەرسی سوبح و دوعای
سەحەر، بە ئەرکی قوبوولّی، سەحەر وتار گەیی
کە بەختی نوستووە «کۆلیل» سوبحی رۆشنی چی
حەرامە مەیکەدە بۆ من، بە شێخی شار گەیی

بیـــا که رایــت منصــور پادشـــاه رسیــد

نویـــد فتح و بشارت به مهــر و مـاه رسیــد

جمـــال بخت ز روی ظفـر نقــاب انداخت

کمــــال عــدل به فریـــاد دادخــواه رسیــد

سپهــر دور خوش اکنـــون کند که ماه آمد

جهان به کام دل اکنون رسد که شاه رسیــد

ز قاطعـــان طریـــق این زمـــان شوند ایمن

قوافـــل دل و دانـــش که مـــرد راه رسیــد

عزیـــز مصـــر به رغـــم برادران غیـــور

ز قعـــر چاه برآمـــد به اوج مـــاه رسیــد

کجاست صوفی دجـــال فعـــل ملحدشکل

بگو بســوز که مهـــدی دین پنـــاه رسیــد

صبا بگو که چه‌ها بر سرم در این غـــم عشق

ز آتـــش دل ســـــوزان و دود آه رسیــد

ز شـــوق روی تو شاهـــا بدین اسیر فـــراق

همـــان رسیـد کز آتش به برگ کاه رسیــد

مرو به خواب که حافــظ به بارگـــاه قبـــول

ز ورد نیـــم شب و درس صبحگـــاه رسیــد

بـۆی زولفتـی دەرون لە جەنـابی سـەبای بیست
لـەو یـارە ئاشنـایە قسـەی ئاشنـای بیست

تۆ شـای جەمـاڵی لوتفێ! بە حاڵی گەدای خۆت
چون گوێـم گەلێ حەکـایەتی شاهـ و گـەدای بیست

خۆشبـۆ دەکـەم بە بـادە دەمـاری دەمـاخ چـون
لەم خێڵـە دین‌فرۆشـە هەمـوو بۆی ریـای بیست

رێـرەو زمـانی مـۆرە لـە رەمـز و لـە رازی دۆس
ماقـم، لە کوێـوە بـادە فرۆشـێ نـەوای بیست

خوایـا! لە کوێیـە مەحـرەمی رازێ هەتـا بڵێـم
چـم وت بە یـار و چۆن و چەنم نـارەوای بیست

گوێ‌بیستـی کەس نەبووگـە دڵی حەق‌شنەوتی من
ئەونـەی لە لێـوی ئێـوە هەڵـە و نـاسزای بیست

بێ بـەش کە بوم لە باخـی گوڵاڵـەی مەگەر چ بوو؟!
کێ لەو بەهـاری چەرخـە نەسیمی وەفـای بیست

مەیگێـڕ! بێ ببیـسە ئەویـن جـاڕی دا بڵێـند
کێ کـردی باسـی ئێمـە لە زاری مـە وای بیست

قـایم لە ژێـری خەرقـە نە یەکجارە مـەی دەکـەین
سـەد جـار پیـری مەیکەدە هەر ماجـەرای بیست

خۆ مەی بە دەنگی نەی نە هەر ئێستاکە نۆش ئەکـەین
چەرخی زەمـان لە مێـژە کە بانگ و سـەڵای بیست

پەنـدی حەکیـم گەوهـەر و گەنجـی ژیـانە هەر
خۆشـبەختە ئەو مرۆڤـە بە گوێچکەی رەزای بیست

«حافـز»! دوعـا و نزایـە وەزیفـەت، نە هیچـی تر
نەیبیست ئەگەر بە تۆ چـە! وە یا خۆ، رجـای بیست

«کۆلیـل» زۆری بیستـووە هەرکـەس هـەزارە هـەر
دارایـە بـەو دوعـایە لـە دەم بێنـەوای بیست

بـوی خوش تو هــر که ز باد صبـــا شنید

از یـــار آشنـــا سخــن آشنـــا شنیـــد

ای شـــاه حسن چشــم به حــال گدا فکن

کـــاین گوش بس حکایت شاه و گدا شنید

خوش می‌کنـم به باده‌ی مشکین مشام جـان

کز دلق‌پـــوش صومعــــه بـوی ریـا شنید

سِرّ خــــدا که عارف سالک به کس نگفت

در حیـــرتم که باده‌فــروش از کجا شنید

یـا رب کجاست محرم رازی که یک زمان

دل شرح آن دهد که چه گفت و چه‌ها شنید

اینـــش ســزا نبـود دل حق‌گـــزار مـن

کز غمگســـار خود سخــن ناســزا شنیـــد

محـــروم اگر شـــدم ز سر کوی او چه شـد

از گلشـــن زمـــانه که بوی وفـــا شنیـــد

ســـاقی بیـــا که عشـــق نـــدا می‌کند بلنـد

کـآن‌کس که گفت قصـه‌ی ما هم ز ما شنید

ما بـــاده زیر خـــرقه نه امروز می‌خوریـــم

صــــد بار پیـــر میکده این ماجــرا شنیـــد

مـــا می به بانگ چنگ نه امـروز می‌کشیــم

بس دور شد که گنبد چرخ این صـدا شنید

پند حکیـم محض صواب است و عیـن خیـر

فرخنـــده آن کسی که به سمع رضـــا شنید

حافـظ وظیفـه‌ی تو دعـا گفتن است و بس

دربنــد آن مبـــاش که نشنیـــد یا شنیـــد

هەوالـــەکان! بە غـەزەڵ پرچی یـار شانە بکەین
شـەوێکە خۆش و درێـژی بە ئەم قسـانە بکەین

دڵان لە خەڵوەتی شـایی جەمن هەموو، یـاران!
بە چـاوەزار دەمێــنی رەقیـبی یـانە بکەین

روباب و چەنگ بە دەنگی بڵیند و خۆش دەڵێن
لە لێـوی خەڵکی دەرون نۆشـی عاشقانە بکەین

بە گیـانی یار! کە عەشق ئـابڕووبەر و هەڵـە نیـن
ئەگــەر بە لوتفـی خــودا تەکیە خالیسـانە بکەین

گەلێکـە بەیـن، لە بەینی ئەویــن و عـاشقی زار
کە یـار نــاز دەکـا شیــوەنێ شــەوانە بکەین

هەوەڵ نەسێحــەتی پیـر ئەم کەلامە شیــرینەن
حەزەر لە هــاوەڵی نامــەردی ئەم زەمانە بکەین

کەسێ لە دایەرەی ئەم کۆڕەدا بە عەشق نەژێت
لە پێشی مــەرگی ئەبێ نوێــژە مردووانـە بکەین

ئەگــەر لە ئێـــوە بکـا «خاجـە» بەخشـشێ داوا
بە لێـوی دڵبـەر و لوتفـی حەواڵە جوانـە بکەین

زەکاتی خاڵــی بە «کۆلیـل» هەر دەگـات بەڵام
لە تــاوی پەرچــەمی نـاوێ خەیاڵی دانە بکەین

معاشــــران گــره از زلـف یــار بـاز کنیــد

شبــی خوش است بدین قصــه‌اش دراز کنیــد

حضور خلوت انس است و دوستــان جمعـند

وَ إن یَکــاد بخـوانیــد و در فــراز کنیــد

ربــاب و چنـگ به بانــگ بلنـد می گوینـد

که گوش هــوش به پیغــام اهــل راز کنیــد

به جـان دوست که غــم پـرده بر شمــا ندرد

گـر اعتمــاد بر الطــاف کـارســاز کنیــد

میــان عــاشق و معشــوق فرق بسیـار است

چو یـار نــاز نمـاید شمـا نیــاز کنیــد

نخست موعظــه‌ی پیـر صحبت این حرف است

که از مصــاحب ناجنـــس احتــراز کنیــد

هر آن کسی که در این حلقه نیست زنده به عشق

بر او نمــرده بـه فتــوای مـن نمــاز کنیــد

وگر طلب کنــد انعــامی از شمــا حافـظ

حوالتــش به لــب یـــار دلنـــواز کنیــد

ئەلۆ ئەی تووتی ئەی ئاوێنەی ئەسرار!
نەبێ خاڵیت قەن هەرگیز لە مینقار
دەمت گەرم و سەرت سەوز و دەمت خۆش
نووانت چونکە خاڵی سەوزەڵەی شار
قسەی بێ پەردە فەرمو بۆ حەریفان
گرێ تۆخوا نەمێنێ با لەسەر زار
گوڵاوی جامەکەت بپژێنە لێمان
کە خەوتوو بەختی ئێمە و ئێوە بێدار
چ ئاهەنگێکی لێدا کاکی نەیچی
کە نوقمی هەڵپەڕینن مەست و وەشیار
چ دەرمانێکی ساقی کردە نێو مەی
کە کەس نەیما لەسەر دەسماڵ و بڕیار
بە ئەسکەندەر نەبڕیا قەترە ئاوێ
بە زۆر و زێڕ نابێ خۆ هەموو کار
لە حاڵی دەردەداران بێن ببیسن!
کە هەر ئۆفێ کتێبێکی لە تۆمار
خواوەننا! دڵ و دینم بە دەس تۆ
لە تالآن و بڕۆی چاو و بڕۆی یار
بە بێ غەم رازی سەرمەستی مەفەرموو
کوتەی دڵ چۆن دەبیسێ نەخشی دیوار
لە سایەی قەندی لێوی یارە «حافز»
لە هەر جێ شەککەری شیعری لەسەر زار
خودایی رەحمی بوو بۆ چینی بێدەس
خودایا حیفزی فەرمووسا لە ئازار!
دڵی «کۆلیل» یارەبی دەوا کەی!
بە دەستی چاوی مەستی شۆخی نازار

الا ای طوطـــی گویـــای اســرار

مبــادا خــالیت شــکر ز منقــار

ســرت سبز و دلت خوش باد جــاوید

که خوش نقشی نمودی از خط یــار

سخن سربستــه گفتــی با حریفــان

خـــدا را زین معمـــا پرده بـــردار

به روی مـــا زن از ساغـــر گـــلابی

که خواب‌آلوده‌ایـــم ای بخت بیـــدار

چه ره بـود این که زد در پرده مطرب

که می‌رقصنـــد با هم مست و هشیـار

از آن افیـون که ســاقی در می‌افکنـد

حریفـــان را نه ســر مـاند نه دستــار

سکنــــدر را نمی‌بخشنـــد آبـــی

به زور و زر میســـر نیست این کـــار

بیـــا و حـــال اهـــل درد بشنـــو

به لفـــظ انـــدک و معنـــی بسیار

بت چینـی عــدوی دین و دل‌هــاست

خـــداوندا دل و دینـــم نگـــه‌دار

به مستـــوران مگـــو اســـرار مستـی

حدیث جـــان مگو بـــا نقش دیـوار

به یمـــن دولت منصـــور شـــاهی

علـــم شد حافـــظ اندر نظـم اشعـــار

خداونـــدی به‌جـــای بنـــدگان کرد

خداونـــدا ز آفـــاتش نگـــه‌دار

مەی بێنە ساقی! وەرزی گوڵان چوو بە ئینتیزار
مانگی نووێ وەبینە لە روخساری شاریار

دونیا بە کەس نەماوە بە مەستی، بپرسە کەی
بەخشی بە کەی کڵاو و بە جەم جام، رۆژگار؟!

هەر تاقە گیان ماوە کەنیشکی ترێ لە کوێن
تاکوو ئەوەش بە ساقی و نازی بکەم نیسار

ئۆخەی لە لوتفی دلّبەر و هەی‌هەی چ حاتەمێ
یارەب کە چاوی پیسی زەمانی نەبێ دوچار!

ئەشعاری من وەخوێنە شەرابی لە گەڵ وەخۆ!
جامی لەعل لە ئێوە لە من دوڕڕی شاهوار

پارشێو ئەگەر نەبێ چییە یاقووتی سوح کە هەن
بەربانگ، مەی رەواترە بۆ عاشقی هەژار

لەو جێ کە پەردەپۆشە جەماڵی سەخاوەتت
تاوانی دڵ ببەخشە کە نەغدێکە بێ‌عەیار

بێ‌شک لە رۆژی ئاخیرەتا بێ‌تەفاوەتە
دەڵقی قەڵەندەری مەس و تەزوێحی شێخی شار

«حافز»! بە چەشنی گوڵ رەمەزانیش چوو لە دەس
ناچاری تێکە بادە بە سەر هات رۆژگار

«کۆلیل» هەر لە مەیکەدە بێ‌بەش نەبوون و بەس
بەو پیرییەش هەمیشە گەڕی پێدەکا نەیار

عیـــد است و آخـــر گل و یـــاران در انتظـار
ســاقی به روی شـــاه ببـین مـاه و مـی بیـــار
دل برگرفتـــه بـــودم از ایـــــام گـــل ولـــی
کـــاری بکـــرد همـت پاکـــــان روزه‌دار
دل در جهـــان مبـــند و به مستـی ســـال کن
از فیـض جـام و قصـه‌ی جمشیـد کامگـار
جز نقـــد جان به دست نـــدارم شـــراب کو
کـــان نیـز بر کرشمـــه‌ی ســـاقی کنم نثار
خوش دولتـی‌ست خرم و خوش خسروی کریم
یـــا رب ز چشـــم زخـم زمانش نگـــاه‌دار
مـی خور به شعـــر بنـــده که زیبی دگر دهـد
جـــام مرصـــع تو بدیـــن در شـاهـــوار
گر فوت شد سحـــور چه نقصان صبـوح هست
از مـــی کنـــند روزه‌گشـــا طالبـان یـــار
زآن‌جـــا که پـــرده‌پوشی عفـو کریـــم توست
بر قلب مـــا ببخش که نقـــدی‌ست کم‌عیـــار
ترســـم که روز حشـــر عنـــان بر عنـــان رود
تسبـــیح شیـــخ و خرقـــه‌ی رنـد شراب‌خوار
حافـــظ چو رفـت روزه و گـــل نیـــز مـی‌رود
ناچـــار بـــاده نوش که از دست رفت کـــار

سەبـــا بە کەوشەنی گیانـــان سەفـــەر درێـغ نەکەیت
لـەوێ بە عاشقــی لێــوەی خەبــەر درێــغ نەکەیت
بە مەیلی بەخت کە پشکووتی ئەی گوڵی بۆن خۆش
نەفەس لە بولبــولی زاری سەحـــەر درێــغ نەکەیت
شـەلاڵی تیـری هیـــلالی چەمـــاوی یەکشـــەوەتم
ئەمێـــستە مـــانگی تـــەواوی، نەزەر درێــغ نەکەیت
جەهــان و هەرچی لەوا بێ دەمێـــکی موختـــەسـەرە
دەمت لە ئەهلــی دەرون، موختەسەر درێــغ نەکەیت
کە ئێستــە کــانی نەبــات و گـەزۆیە لێـــوەکەتـــان
کەرەم کە قەنـــد و لە تووتی شەکەر درێــغ نەکەیت
بەیـــانی شیعــرم ئەکـا شــەرحی گەورەیی کەرەمت
بەراتـــی شیعـــــر و خەلاتـی هونــەر درێــغ نەکەیت
کە نـــاوی خێــرت ئەشــێ داگـرێ ولاتی کــەلام
لە کیـــژی جوانی قســەم لوتفی زەڕ درێــغ نەکەیت
غوبـــاری غەم لە دڵ ئــەڕوات و چـا دەبی «حافــز»!
تکـــایە ئـــاوی دییـــەت بۆ گـوزەر درێــغ نەکەیت
«عومـــەر» شکـــایەتی هێـــناوە بۆ جەنـــابی دییـــەت
قــەزاوەتی بە هەقـــت، تۆ عومـــەرا! درێــغ نەکەیت

صبا ز منزل جانان گذر دریغ مدار

وز او به عاشق بیدل خبر دریغ مدار

به شکر آن که شکفتی به کام بخت ای گل

نسیم وصل ز مرغ سحر دریغ مدار

حریف عشق تو بودم چو ماه نو بودی

کنون که ماه تمامی نظر دریغ مدار

جهان و هرچه در او هست سهل و مختصر است

ز اهل معرفت این مختصر دریغ مدار

کنون که چشمه‌ی قند است لعل نوشینت

سخن بگوی و ز طوطی شکر دریغ مدار

مکارم تو به آفاق می‌برد شاعر

از او وظیفه و زاد سفر دریغ مدار

چو ذکر خیر طلب می کنی سخن این است

که در بهای سخن سیم و زر دریغ مدار

غبار غم برود حال خوش شود حافظ

تو آب دیده از این رهگذر دریغ مدار

ئەی سەبا! بۆنی شنەی زولفی چەمانێکم ئەوێ
زامداری غەمییم مەرهەمی گیانێکم ئەوێ

لە دڵی بێبەر و بارم بدە دەرمانە بەرێ
لە غوباری دەری ئازیز نیشانێکم ئەوێ

من و ئەو دڵمە لە سووچێکی تەماشا لە شەڕین
وا لە بارامی دییەی تیر و کەوانێکم ئەوێ

لە بیاوانی غەما پیر و پەرێشانە دڵم
لەعلی شایی لە دەسی تازە جووانێکم ئەوێ

یەک دو دەورێ بە نەزانان بدە ساقی کە ئەگەر
وەرینەگرێ لە دەست جامی نەزانێکم ئەوێ

یا ئەمێستا وەرە شا بین و بنۆشین شەراب
یا لە دیوانی ئەجەل مۆڵەتی مانێکم ئەوێ

دوێنەشەو دڵ لە دەسم چوو کە وتی «خاجە» بە سۆز
ئەی سەبا بۆنی خۆشی زولفی فلانێکم ئەوێ

دڵی «کۆلیل» دەڵێ بۆیە لەگەڵتا بە شەرم
تۆ کەژی بەرزت ئەوێ من کەژەوانێکم ئەوێ

ای صبا نکهتی از کوی فلانی به من آر
زار و بیمار غمم راحت جانی به من آر

قلب بی‌حاصل ما را بزن اکسیر مراد
یعنی از خاک در دوست نشانی به من آر

در کمین‌گاه نظر با دل خویشم جنگ است
ز ابرو و غمزه‌ی او تیر و کمانی به من آر

در غریبی و فراق و غم دل پیر شدم
ساغر می ز کف تازه جوانی به من آر

منکران را هم از این می دو سه ساغر بچشان
وگر ایشان نستانند روانی به من آر

ساقیا عشرت امروز به فردا مفکن
یا ز دیوان قضا خط امانی به من آر

دلم از دست بشد دوش چو حافظ می‌گفت
کای صبا نکهتی از کوی فلانی به من آر

ئەی سەبـا! بۆنی خۆشی خـاكی سەكۆی یـارم ئەوێ
لاوە غـــەم لـەو دڵـــە مزگێنیـــی دڵـــدارم ئـەوێ

گوڵەباســێ لە دەمــی یاســی نەفــەس‌بێـنی بڵـێ
خۆش خەبەر دەست‌وخەتێكی گوڵی ئەسـرارم ئەوێ

هەڵمــژێ تا لە نەسیمــی كەرەمت گیــانی حــەزم
سووكـە عەتـرێ لە عەبیــری گوڵی گوڵزارم ئەوێ

بێ ئــەوەی تـــۆزی گەلــی فیتنــە بنیـشێت لە دڵ
تۆ وەفــاكەت! كە غوبــارێك لە رێـی یـارم ئەوێ

تۆزی كـۆی رێــگوزەری گـوڵ بە گـلاراوی دڕوو
بۆ قــەراری گلی دوو نێــرگزی خوێن‌بــارم ئەوێ

گیـان لە سەر لەپ نییەتی گێـژی و ساوێلكە سەری
بۆیــە دایـم خەبــەری دڵبــەری وەشیــارم ئەوێ

تۆ كە ئـازادی و شـادی لە چەمــەن ئەی مەلی گـەل!
بۆ هەڵــۆی بەنـدی قەفــەس ناڵــە و هــاوارم ئەوێ

تــاڵ چون كەكـرە دەمی گیــانە بە هیجـرانی ئەوین
شەربـــەتی نـازی لە سـەر لێـوی شەكەربـارم ئەوێ

رۆژگــارێكە كە دڵ بـــەژنی مـورادێكـی نــەدی
ساقیــا جـامی مــەی ئاوێنــەیی روخســارم ئەوێ

ئەو جبـەی «حافز»ە رەنگین كە! بە مـەی خۆشی خراو
بێـــنە بــازاڕ كە رسـوا سـەری نێـو شــارم ئەوێ

قـەل و قـــالاو لە نێـو بـاخ و چەمەن دەركە هەموو
تاقــە «كۆلیــل»ـی سـەقز، پیـری وەفــادارم ئەوێ

ای صبـــا نکهتـــی از خـــاک ره یار بیـــار

ببـــر انـــدوه دل و مـــژده‌ی دلـــدار بیـــار

نکتـــه‌ای روح فـــزا از دهـــن دوست بگـــو

نامـــه‌ای خوش خبـــر از عالـــم اسرار بیـــار

تا معـــطر کنم از لطـــف نسیـــم تو مشـــام

شمـــه‌ای از نفحـــات نفـــس یـــار بیـــار

به وفـــای تو که خاک ره آن یـــار عزیـــز

بی غبـــاری که پدیـــد آید از اغیـــار بیـــار

گردی از رهگـــذر دوست به کوری رقیـــب

بهر آســـایش این دیـــده‌ی خونبـــار بیـــار

خـــامی و ساده‌دلی شیوه‌ی جانبـــازان نیست

خبـــری از بـــر آن دلبـــر عیـــار بیـــار

شکر آن را که تو در عشـــرتی ای مرغ چمن

به اسیـــران قفـــس مژده‌ی گلـــزار بیـــار

کام جان تلخ شد از صبـــر که کردم بی دوست

عشـــوه‌ای زان لب شیـــرین شکربـــار بیـــار

روزگـــاری‌ست که دل چهـــره‌ی مقصود ندید

ساقیـــا آن قـــدح آینـــه کـــردار بیـــار

دلق حافـــظ به چه ارزد به مـــی‌اش رنگیـــن کن

وان گهش مست و خـــراب از سر بـــازار بیـــار

چێـــره بنوێنـــه كه خۆمـــم لـه دڵ و يـــاد بـــەرێ
خەرمـــەنی عاشقـــی سووتـــاو بلا بـــاد بـــەرێ!
دڵ و گيـــانـم كه بە تۆفـــانـی بەلا داوە چ بـــوو
سەيلـی غـەم بێت و رەگ و ريشه لە بونيـاد بـــەرێ
عەمبـــەری خاليسی زولفی ئـەوی كەس هەڵنەمژی
با دڵـی خـــاو قسـەی پرچـی لە سـەر يـاد بـــەرێ
سيـــنه فەرموو گڕی نێو كوانووەكەی فارس ببات
چـاو فەرموو كه شكۆی دەجلەيی بەغـداد بـــەرێ
پيـــری مەيخانه فەقـــەت دەوڵـــەتی دادی بگـــەڕێ
چ دەبێ نێـــوی من ئـەم چەرخـه بە بێـداد بـــەرێ
بێ خەبـاتێ بە خـــەراباتی ئەوين قـــەت نەگـــەيی
هەركه فێـــرخوازە دەبێ جەور لە ئوستـاد بـــەرێ
دەمـی مـــردن نەفـــەسێ بێـــته ســـەرينم لـــەوەلا
تا بە ئەڵحـەد لەشـی خاڵـی لە غـەم ئـــازاد بـــەرێ
دوێشەو ئەيوت كه بە خەنجێری دو ئەبرۆت ئەكوژم
ئەم هـــەوا خوا لە ســـەر و خاتـــری جەللاد بـــەرێ
«حافـــز» ئازيـــز دڵـی ناسكـــە، لەم دەركـه كەســـێ
بێمەتـــەق دانەكـــەوێ، ناڵـــه و فەريـــاد بـــەرێ
دڵـی «كۆليـــل»ـه دڵـم، خوايـه هەڵـی نەگری ئەدی
كـه قوشـــێ شيـــوەنی شيـــرين بە فەرهـــاد بـــەرێ

روی بنمای و وجود خودم از یاد ببر
خرمن سوختگان را همه گو باد ببر

ما چو دادیم دل و دیده به طوفان بلا
گو بیا سیل غم و خانه ز بنیاد ببر

زلف چون عنبر خامش که ببوید هیهات
ای دل خام طمع این سخن از یاد ببر

سینه گو شعله‌ی آتشکده‌ی فارس بکش
دیده گو آب رخ دجله‌ی بغداد ببر

دولت پیر مغان باد که باقی سهل است
دیگری گو برو و نام من از یاد ببر

سعی نابرده در این راه به جایی نرسی
مزد اگر می‌طلبی طاعت استاد ببر

روز مرگم نفسی وعده‌ی دیدار بده
وان گهم تا به لحد فارغ و آزاد ببر

دوش می‌گفت به مژگان درازت بکشم
یا رب از خاطرش اندیشه‌ی بیداد ببر

حافظ اندیشه کن از نازکی خاطر یار
برو از درگهش این ناله و فریاد ببر

شـــەوی دیـــداره دووری دەردی بـــاره
هەتـــا سوبحی سەحـــەر دڵ مەستی یـاره
لە ڕێگەی عەشق ئەبێ ئەی دڵ نەدەی کۆڵ!
کە مەرجی عاشقـــی ڕەنجـــە و پـــەژاره
بە بـــەرد و دەردی دووریشـــــم بکـووژی
لە ڕەنـــدی تۆبـــە ناکـــەم نـــا، قـــەراره
هەڵـــێ ئەی مـــانگی ڕۆشن تۆ بی و خـــوا!
شـــەوی دووری گەلـــێ بێنـوور و تـــاره
دڵـــم ڕۆیشت و نەمـــــدی قـــامەتی یـــار
ئەمـــان لـەم زڵمـــە وەی لەم ڕۆژگـــاره!
وەفـــا شـــەرتی جەفـــاکێشانە «حافز»!
کە تاجـــر کـــاری قـــازانج و خەســاره
بە «کۆلیـــل»یشی پیـــری دەیـــر فـــەرموو
کە زستـــــان تا نەبێ کەنـــگێ بەهـــــاره

شب وصل است و طی‌شد نامه‌ی هجر

سَـــلامٌ فیـهِ حَتّی مَطْلَـعَ الفَجــر

دلا در عــاشقی ثــابت قــدم باش

که در این ره نبــاشد کار بی اجــر

من از رنــدی نخواهــم کرد توبـه

و لو آذیتــــنی بِالهَجــر وَ الحَجــر

برآی ای صبـــح روشن‌دل خـدا را

که بس تاریک می‌بینم شب هجــر

دلــم رفت و ندیــدم روی دلــدار

فغان از این تطاول آه از این زجــر

وفــا خواهی جفــاکش باش حافظ

فَــإنَّ الرِّبـح وَ الخُســران فِی التَّجــر

عومر ئەگـەر بێت و بە مەیخـانە بگەم جـارەکی دی
کاری رەنـدانە نەبێ شـەرتە نەکەم کـارەکی دی
چـاو بە گریانەوە بریـا وەکو جـاران دەچـووم
ئـاوپژێنی بـەری مەیخـانە بکەم جـارەکی دی
ئاشنـایێ نیـیە لەم خێڵـە خودایـا کـەرەمێ!
تـا بـەرم گەوهـەری تاقـانە بە کڕیـارەکی دی
یار ئەگـەر چوون و خەمی هـاودەمی مێژینی نەبوو
من کە حاشا گوڵی غـەم بەم لە یەخەی یـارەکی دی
چەرخی شیـنم لەگەڵا بێت لە نێـو جەغزی دەخـەم
هەر وەکوو نوختە خەت و خاڵی بە پەرگـارەکی دی
خـاترم مەیلی بە شـەڕ نین ئەگەری بـاس نەکەن
نازی چـاوی، خەمی دوو رێگر و شەوگـارەکی دی
دیتـە چۆن عەشقـی نهێنی مـە بە گـۆرانی ئەڵێـن
گەل بە ناڵەی دەف و نەی، عوود و هەموو تـارەکی دی
هەر دەمـم نـاڵە و دەردێ، کە فەلـەك هەر ساتێ
دەهـەژێنێ دڵـی زامـار بە ئـازارەکی دی
نیـیە «حافز» بە تەنـێ کەوتە گـەروی داوی ئەویـن
لـەم بیـاوانە مەگـەر دەرچـووە دڵـدارەکی دی؟!
هەرکە «کۆلیـل»ـی هونەر بێت و ئەویـنداری گەلی
سـەری رۆیی وەکـو مەنسوور لە سـەر دارەکی دی

گر بود عمـــر به میخـــانه رسم بـــار دگر

بجـــز از خدمت رنـــدان نکنـــم کار دگر

خـــرم آن روز که با دیـده‌ی گریـان بروم

تا زنـــم آب در میکـــــده یک بـــار دگر

معــــرفت نیست در این قـــوم خدا را سببی

تا بـــرم گوهـــر خود را به خریـــدار دگر

یار اگر رفت و حق صحبت دیرین نشناخت

حـــــاشَ لله که روم مـــن ز پی یـــار دگر

گر مســـاعد شودم دایـره‌ی چـــرخ کبود

هـــم به دست آورمش بـــاز به پرگار دگر

عافیـــت می‌طلبـــد خاطـــرم ار بگـــذارند

غمـــزه‌ی شوخش و آن طرّه‌ی طَـرّار دگر

راز سربستـــه‌ی ما بین که به دستان گفتـــند

هر زمـــان با دف و نی بر ســـر بـــازار دگر

هر دم از درد بنـــالم که فلک هـــر ساعت

کنـــدم قصـــد دل ریـــش بـه آزار دگر

بـــازگویم نه در این واقعه حافـــظ تنهاست

غرقـــه گشتـــند در این بادیـــه بسیـــار دگر

ئەی رون بە نووری کولمەکەتن لالەزاری ژین
بێرۆ! کە وەک خەزانــە بە بێ تۆ بەهــاری ژین
بــارانی ئەشکی دیـــدە بە خورِ دا بکــا رەوان
وەک بەرق چونکە چوو لە غەمت رۆژگاری ژین
ئەم چەن سەعـاتە مۆلەتـی دیـدار دەس ئـەدات
کاری مە جێبـەجێ کە! کە نەدیـارە کـاری ژین
تا کەی خــەوی شرین و شـەرابی سەحەر نووێن
وەشیـــار بن دەخیلـــە کە چوو ئیختیـاری ژین
دوێ دەگوزەران و یەک نەزەری بۆ مە پێنەبوو
بێــچارە دڵ کە یـــاری نەبوو رێگوزاری ژین
ترسی لە بەحـــری سوور و شـــەپۆلی فەنا نیـــیە
هەرکەس دەکات زاری بە نوختەی مەداری ژین
هەر گۆشـــەیێ کەمینگەیی رووداوەیێــکە نـــۆ
پەوکێ وەهـــا بە تاوە هەراســـان سوواری ژین
من بێتەمـــەن دەژێم و بە ســـەیری مەزانە تۆش
دووری لە یـــار مەرگـە، نە رۆژ و شـەواری ژین
«حافز»! غەزەڵ بلێ کە لە سەحنی هەموو جەهان
نەخشی قەلـــەم دیارە لە کۆی یادگـــاری ژین
«کۆلیل»! ئەگەر بەرێزە قەڵەم نەخش و بەرهەمی
پێم بێـــژە بۆ لە بەنـــدە هونەرمەندی شاری ژین

ای خـــرم از فـــروغ رخت لالـــه‌زار عمـــر
بـــازآ که ریخت بی گل رویت بهـــار عمـــر
از دیـــده گر سرشک چو باران چکـــد رواست
کـــاندر غمت چو بـــرق بشـــد روزگار عمـــر
این یک دو دم که مهلت دیـــدار ممکـن است
دریـــاب کار مـــا که نه پیـــداست کار عمـــر
تا کی مـی صبـــوح و شکـــرخواب بـــامـــداد
هشیـــار گرد هـــان که گذشت اختـــیار عمـــر
دی در گـــذار بود و نظـــر ســـوی مـــا نکرد
بیـــچاره دل که هیـــچ ندیـــد از گذار عمـــر
اندیشـــه از محیـــط فنـــا نیست هـــر که را
بر نقطـــه‌ی دهـــان تو باشـــد مـــدار عمـــر
در هر طرف که ز خیـل حوادث کمین‌گهی‌ست
زان رو عنـــان گسسته دوانـــد ســـوار عمـــر
بی عمـــر زنـــده‌ام من و این بس عجب مـــدار
روز فـــراق را که نهـــد در شمـــار عمـــر
حافـــظ سخن بگـــوی که بر صفحـــه‌ی جهان
این نقـــش مانـــد از قلمـــت یادگـــار عمـــر

دیسان لە دونـدی سـەروی چەمـەن بولبـولی سەبـوور
خوێنـدی: (خودا لە چـاوی چەپـەڵ گوڵ بکا عوبوور)
ئـەی گوڵ کە شـۆخی باخـی، لە شوکرانـەدا بەخێـر
بولبـول کە شێـتی تۆیـە لە سـەر لاوە بـۆی غورروور
ناکـەم لە دەستـی غەیبـەتی بالآت قـەت شکـات
دووری نەبێ هەتـا نیـیە قـەدری دەمـی حوزوور
هەرکـەس بە وەسڵی دلبـەر و گۆڤـەندی خۆیە شـاد
ئێمـەش غەمـی نیگـارە لە سەرمـانە هـۆی سورروور
سۆفی ئەگـەر بە حۆری و کۆشکی بەهـەشتە خـۆش
مەیخـانە قەسـری ئێمـەیە، ئازیزمـانە حـوور
مـەی خۆ! بە دەنـگی چەنگ و مەخـۆ غەم ئەگەر کەسێ
فەرمـوی خـراوە بـادە بلـێ: (یا هـووەلغەفوور)
«حافـز»! شکـاتی چیتـە لە خوسپـەی فیـراقی یـار
شایـی لە شـوێنـە شیـوەن و بە شوێـن شـەوایە نـوور
مەیگێڕ بێـنە بـادە! کە «کۆلیـل» بێـتە حـاڵ
خۆش هەڵدەکا لە نەزمی خۆشی(هـەی لەدوور لەدوور...)

دیگر ز شـــاخ ســـرو سهـــی بلبـــل صبـــور
گلـــبانگ زد که چشـــم بد از روی گل به دور

ای گل به شکـــر آن که تویی پادشـــاه حســن
با بلبـــلان بیـــدل شیـــدا مکـن غـــرور

از دست غیـــبت تـو شکـــایت نمی‌کنـــم
تـا نیست غیبـــتی نبـــود لـــذت حضـــور

گر دیگـــران به عیش و طرب خرمنـــد و شـــاد
مـــا را غـــم نگـــار بود مایـــه‌ی ســـرور

زاهـــد اگر به حور و قصـــور است امیـــدوار
ما را شرابـــخانه‌ی قصـــور است و یـــار حـور

می خور به بانگ چنگ و مخور غصه، ور کسی
گویـــد تو را که بـــاده مخـــور گو هُوَ الْغَفُـور

حافظ شکـــایت از غـــم هجـــران چه می کنی
در هجـــر وصـــل بـــاشد و در ظلمـت است نور

مـــانگی تابـــانت لە نۆ هەڵـــدێ لە کەنعـــان غەم نەخۆی
کۆخی شین رۆشن دەبێ چون کـاخی کەیوان غەم نەخۆی
ئەی دڵی غەمگیـــن گومـــانی بـەد بە خۆ رێگا نـەدەی
گەرچی بێسامـــانە سـەر، دێتـۆ بە سامـــان غەم نەخۆی
عومر ئەگەر وەرزی بەهـــاری بێ، لەسـەر تەختی چەمەن
پەرچەمی گوڵ مـاچ ئەکەی بولبول! هەمیسان، غەم نەخۆی
دەوری گەردون گەر دو رۆژێ چەرخی وەک چاوت نەبوو
هەردەمێ جۆرێ دەسوورێ چـەرخی دەوران غەم نەخۆی
هەی لە دەس هیـــوا نەدەی چون نادیـــارە دەستی غەیب
چۆن لە پشتی پەردەی ئـاڵوگـۆڕە پەنهـان، غەم نەخۆی
گوڕمـــی لافـــاوی فەنـــا دونیـــا لە بێخـــا هەڵکـەنێ
گەمیەوان تا نووحـە ئەی دڵ! قەت لە تۆفـــان غەم نەخۆی
چون بەرەو کـــابەی ئەوین چـــۆڵ و بیـــاوان تەی دەکەی
نەشتـــەرن هەرچـــەن لە رێتـــا دڕکەزێکان غەم نەخۆی
گەرچی رێگـــا پڕ لە خۆفـــە و ماڵـــی دڵبـــەر دوورەدەس
هیچ رێگـــایێک نیـــن نەشکێـــتە پایـــان غەم نەخۆی
حـالّی ئێمـە و دەردی دووری یـــار و سەرســـەختی رەقیب
هەر هەموو روونـــاکە بۆ گـــەردوونی گەردان غەم نەخۆی
تا بە دەروێشـــی لە داوی زولفـــی شـــەو «حافز»! هـەوات
زیکری دڵـــداری دەلالـــە و دەرسی قورئـــان غەم نەخۆی
ئەی گوڵی «کۆلیـــل» ئەگـــەرچی هاتە وێزەت بای خەزان
دێتە گـــوێ هـــاواری گەرمـــی بای بەهـــاران غەم نەخۆی

یوسف گمگشته بازآید به کنعان غم مخور
کلبه‌ی احزان شود روزی گلستان غم مخور
ای دل غمدیده حالت به شود دل بد مکن
وین سر شوریده بازآید به سامان غم مخور
گر بهار عمر باشد باز بر تخت چمن
چتر گل در سر کشی ای مرغ خوشخوان غم مخور
دور گردون گر دو روزی بر مراد ما نرفت
دایماً یکسان نباشد حال دوران غم مخور
هان مشو نومید چون واقف نه‌ای از سِرّ غیب
باشد اندر پرده بازی‌های پنهان غم مخور
ای دل ار سیل فنا بنیاد هستی بر کند
چون تو را نوح است کشتی‌بان ز طوفان غم مخور
در بیابان گر به شوق کعبه خواهی زد قدم
سرزنش‌ها گر کند خار مغیلان غم مخور
گرچه منزل بس خطرناك است و مقصد بس بعید
هیچ راهی نیست کان را نیست پایان غم مخور
حال ما در فرقت جانان و ابرام رقیب
جمله می‌داند خدای حال گردان غم مخور
حافظا در کنج فقر و خلوت شب‌های تار
تا بود وردت دعا و درس قرآن غم مخور

نەسیحەتێکت ئەکەم بیستنی رەوایە، خەتان
شەمی نەسیحەتی دڵسۆز هەڵنەکەی لە دڵان
جەهانی پیر کەمینی کە ناوە بۆ تەمەنت
لە باخی وەسڵی جووانان گوڵێ بەبۆ کە جووان!
سوئالی هەر دو جەهانم لە عاشقێ پرسی
وتی بزانە کە بێعەشقە هیچ هەر دو جەهان
مەگەر بە دۆسی ئەمەگدار و سازی سازی بڵێم
سەدای زیل و بەم و ناڵەناڵی دڵ لە شەوان
لەسەر ئەوەم کە نەخۆمۆ مەی و گوناح نەکەم
سرشت ئەگەر بە تەویرم بکات و بێتە کەوان
کە دابەشی ئەزەڵی بێحوزووری ئێمە کرا
ئەگەر کەمێ بە مەرامت نەبوو، خەتا لەوەدان
کە هەر لە دڵ جەمە خێڵی خەیاڵی خاڵی رەشی
لە موشک و مەی وەکو گوڵ پڕ کە جام ساقی ئەمان!
پیاڵە پڕ کە لە یاقووتی تەڕ دە سا مەیگێڕ!
خەڵاتی ئاسەفە، دیقی حەسوودە، بەزمی زەمان
لە نازی ساقیە مەیخانە جێگەمانە دەنا
هەزار جارە پیاڵەم بە قەستی تۆبە شکان
دەلالی چاردە ساڵ و دو ساڵە مەی لەگەڵێن
نیگاری چووک وەکوو گەورە بۆ مە هاتە ژووان
هەواڵی ئێمە بە قەیسی شەتەکدراو بەرن
کە چی دەکا دڵی مەجنوونمان لە بەندی گران
کە تیری نێرگزی ساقی لە سەر کەوانی برۆن
نەکەی لە مەیکەدە «حافز»! لە تۆبە شەرح و بەیان
شەهیدی تیر و کەوانی کریشمەکەت مەیگێڕ!
بە بیری عاشقی «کۆلیل» خۆشەویسی خودان

نصیحتی کنمت بشنو و بهانه مگیر
هر آنچه ناصح مشفق بگویدت بپذیر
ز وصل روی جوانان تمتعی بردار
که در کمینگه عمر است مکر عالم پیر
نعیم هر دو جهان پیش عاشقان بجوی
که این متاع قلیل است و آن عطای کثیر
معاشری خوش و رودی بساز می‌خواهم
که درد خویش بگویم به ناله‌ی بم و زیر
بر آن سرم که ننوشم می و گنه نکنم
اگر موافق تدبیر من شود تقدیر
چو قسمت ازلی بی‌حضور ما کردند
گر اندکی نه به وفق رضاست خرده مگیر
چو لاله در قدحم ریز ساقیا می و مشک
که نقش خال نگارم نمی‌رود ز ضمیر
بیار ساغر در خوشاب ای ساقی
حسود گو کرم آصفی ببین و بمیر
به عزم توبه نهادم قدح ز کف صد بار
ولی کرشمه‌ی ساقی نمی‌کند تقصیر
می دوساله و محبوب چارده ساله
همین بس است مرا صحبت صغیر و کبیر
دل رمیده‌ی ما را که پیش می گیرد
خبر دهید به مجنون خسته از زنجیر
حدیث توبه در این بزمگه مگو حافظ
که ساقیان کمان ابرویت زنند به تیر

چێـــره بنوێنـــه و فەرمـــوو کە دڵ و گیـــانم ئەوێ
من پەپـــوولەی شەمی رووتم حەزی سووتـــانم ئەوێ
وەره لەو خاکمـــه هەڵسێـــنه کە کـــوژراوی ئەتـــۆم
وەشکـــه لێـــوم، مەدەدی زەمـــزەمی جـــارانم ئەوێ
بێـــژه دەروێش! ئەگـــەرت سیـــم و زەڕێ نین لە تۆ
رەنگی زەردی غـــەم و زێوی شـــەتی چـــاوانم ئەوێ
ســـاز و چـــەنگت هەیە گەر عـــوود نەبوو بێژه بە من
مەنگەڵی لەش، گڕی حەز، عوودی دڵ و گیانم ئەوێ
یا لە ســـەر کێشه جـــەی فێـــڵ لە ســـووچێکەوە یـــا
هەڵپـــەڕه و فـــڕ دە عەبـــا رەقسی موریـــدانم ئەوێ
دڵ دەڵـــێ داکـــەنه ئەو خەرقـــه پڵاسیـــنه لە بـــەر
شل کە! ســـەر کیسه، مـــەی و باوەشی گیانـــانم ئەوێ
بەخت ئەگەر یـــاره بڵێ خەڵکی جەهـــان لەشکر بن
هەر دو عالـــەم دژە گەر دۆسه ئەویـــن، وانـــم ئەوێ
مەیلی ئـەم کۆچه لە ســـەر لاوە لە ســـەر جـــام بنێ!
لە چەمـەن من کە شنـــەی سەروی خەرامـــانم ئەوێ
خۆزگە دیبـــات بە هۆی ئاگـــر و ئاوی دڵ و چـــاو
زێـــڕه رەنگم، زڕه لێـــو، کۆشی بە گریـــانم ئەوێ
وەعزی شیـــوەن بەســـه واعیز کە دەبیـــنی «حافـــز»
شـــادیئـــارایه بڕۆ شیعـــری تەڕ و جوانـــم ئەوێ
قـــڕەقـــڕ بەسیـــەتی قـــالاو! لە گوڵـــزاری ئەویـــن
دەنگـــی «کۆلیـــل»ـی گەل و بولبـــولی نالانـــم ئەوێ

روی بنمـــا و مرا گو که ز جـــان دل بر گیـــر
پیش شمـــع آتش پـروا نه به جان گو در گیـر
در لب تشنـــه‌ی ما بیـــن و مـــدار آب دریـغ
بر سر کشته‌ی خویش آی و ز خاکش بر گیـر
ترک درویش مگیـــر ار نبـــود سیـــم و زرش
در غمت سیم شمار اشک و رخش را زر گیـر
چنگ بنـــواز و بســـاز ار نبـــود عود چه بـــاک
آتشـــم عشق و دلـــم عود و تنـــم مجمر گیـر
در سمـــاع آی و ز سر خرقه برانـداز و برقص
ور نه با گوشـه رو و خرقــه‌ی مـا در سر گیـر
صوف بر کش ز ســـر و باده‌ی صافی در کش
سیـــم دربـــاز و به زر سیـــم‌بری در بر گیـر
دوست گو یـار شو و هر دو جهان دشمن باش
بخت گو پشت مکن روی زمیـــن لشکـر گیـر
میـــل رفتن مکن ای دوست دمـی با مـــا بـاش
بر لب جوی طرب جوی و به کف ساغر گیـر
رفته گیـــر از بـرم و زآتش و آب دل و چشـم
گونـــه‌ام زرد و لبـــم خشک و کنـــارم تر گیـر
حافـــظ آراستـــه کن بـزم و بگـو واعـــظ را
که ببیـــن مجلســـم و ترک ســـر منـــبر گیـر

لە حــەق سپــاس! کە دیتــم دەلال و دلّبــەر بــاز
دلّت بە پــاکی و راســی لەگــەلّ دلّــم هەمــڕاز
نەبوو لە فیکــری بەلاّ ڕێــڕەوی تەرێقــەت قەت
چ عاشقــیێ هەیــەتی غەم لە لێــژی و هــەوراز؟!
ڕەقیــب حەیفــــە بزانــێ غەمیــــنە دلّ بــۆ تــۆ
کە نیــنە سیــنەیی یــــارانی کیــنە مەحــرەمی راز
جەمــــالّی ئێــوە ئەگەرچی لە عەشقی ئێمە ســەرە
وەلیّ لە ڕێگـــــەی ئەوینــــت مەحــــالّە لادەم باز
لە ســـۆزی دلّ چ دەچێــــژم! مەگەر سوئــالی وا
بکــەی لە چـــاو کە سیخـۆڕی خـۆتن و غەمماز
دەسی قـــەزا عەجەب ئـــاژاوەییێکی هەلّگــرسان
کە ڕەشتی نێــرگزی مەستی لە کــۆی کلاّتی نــاز
بە ئەو سەفــایە کە ڕۆشــن بە یــارە مەجلیســمــان
جەفــــایەکیشی ئەگەر بوو بســووتە شەمشێـــواز
مەبەس کریشمــــەتە جوانـــن دەنا نیــازی نین
جەمالّ و شەوکەتی مەحموودی من بە مەدحی ئەیاز
مەلّیّ کە زوهــرە هونەرمــــەند و پەنجە نەخشیــنە
لە ســـەردەمێ کە غــەزەلّخوێنە «حافــز»ی شیراز
هەلّـــۆ قیاسی لەگــەلّ چۆکە چووکــەیێ ناکەن
نە عەشقی پابەنی «هۆمـــەر» نە بەژنی سەروی تەناز

هــزار شکر که دیــدم به کــام خویشت باز

ز روی صــدق و صفــا گشته با دلم دمســاز

رونــــدگان طــــریقت ره بــــلا سپــــرند

رفیــق عشق چه غــم دارد از نشیب و فــراز

غــم حبیب نهــان به ز گفت‌وگوی رقیب

که نیست سیــنه‌ی ارباب کیــنه محــرم راز

اگرچه حســن تو از عشــق غیــر مستغنی‌ست

من آن نیــم که از این عشــق‌بازی آیم بـاز

چه گویمت که ز ســوز درون چه می‌بیــنم

ز اشک پــرس حکــایت که من نیـم غمــاز

چه فتــنه بود که مشــاطه‌ی قضــا انگیخت

که کرد نرگس مستــش سیــه به سرمه‌ی ناز

بدین سپــاس که مجلس منور است به دوست

گرت چو شمــع جفــایی رسد بسوز و بسـاز

غرض کرشمه حسن است ور نه حاجت نیست

جمــال دولت محمــود را به زلـف ایــاز

غــزل‌ســرایی ناهیــد صــرفه‌ای نبــرد

در آن مقــام که حافــظ بــرآورد آواز

منـــم کە بوو بە دیـاری بەهــار چـــاوم بـــاز؟!
سپـاس چۆن بکـــەم ئەی چارەسازی بەندە نـەواز
لە روو مەشـــۆوە غـوبـــار، ئەی نیـــازداری بەلا!
موڕادی عەشقە چون ئەکسیری گەردی ئەرکی نیاز
لە کەند و لەندی ئەویـن وەرمەگێـــڕە روو ئەی دڵ!
کە رەنـدی رێگـــە نەترســا لە لێـژی و هـــەوراز
کەسێ کە عاشقـە دەسنوێژ ئەگەر بە خوێن نەگرێ
بە نوێـــژی وایـە نەدا قـەت ئیمــامی ئێمـە جـــەواز
لە ئـەم فریـوســـەرا هـــەر گـــرەو بـە دڵ دانـــێ!
مەگەر پیـاڵە نەبێ مەگرە جامـی دەستـی مەجـــاز
لە ئەهلـــی دڵ بە لـەتـــێ مـــاچ بکـــڕە دۆعـــایێ
لە مەکـــری دژمنـی گیـــان و لەشت دەبێ بە پـوواز
ڕەواجی دا لە حیـجاز و عـەراق، عەشـــق و ئەویـــن
مەقـــامی خۆشی غەزەلیـــاتی «حـــافز»ی شیـــراز
لە سای پەرچـــەم و عەشقـــی هەتـــاویا «کۆلیـــل»!
قەڵـــەم بە نووســـەری دیـــوانی خۆشمـی ســـەربـاز!

منم که دیده به دیدار دوست کردم باز

چه شکر گویمت ای کارساز بنده‌نواز

نیازمند بلا گو رخ از غبار مشوی

که کیمیای مراد است خاک کوی نیاز

ز مشکلات طریقت عنان متاب ای دل

که مرد راه نیندیشد از نشیب و فراز

طهارت ار نه به خون جگر کند عاشق

به قول مفتی عشقش درست نیست نماز

در این مقام مجازی بجز پیاله مگیر

در این سراچه‌ی بازیچه غیر عشق مباز

به نیم بوسه دعایی بخر ز اهل دلی

که کید دشمنت از جان و جسم دارد باز

فکند زمزمه‌ی عشق در حجاز و عراق

نوای بانگ غزل‌های حافظ از شیراز

ئەی نۆنمـــامی جوانـــی خەرامـــان دەڕۆیـە رێ
یەک نـــازی ئێـــوە بۆ مـە هـەزاران نیـــاز ئەزێ
پیـرۆزە شێـــوە جوانەکەتـــان چون دەسـی ئـەزەڵ
بۆ بـــەژنی تۆی بڕیـــوە کـــەوا نـازی وا بەجـێ
وەک عوود بێـــژە هەرکە نەســـووتێ دەبـێ دڵی
ئاواتـــی بۆنـــی سومبـــولی ئێمـــەی لـە تۆ نەبێ
ســۆزی دڵی پەپوولـــە بە شۆڵەی شـــەمە و کەچی
بێ مۆمـــی رووتـــە گیـانی ئەمن ئاوری تێـدەچێ
دوێشـــەو نەبووی سۆفـــی لە مـــەی بـوو بـە تۆبەکار
مەیخـــانە تا کـــراوە شکـــا تۆبـــەکەی شـــەوێ
وەک زێـــڕ ئەگەر بشـــمبەنە نێـــو زاری گاز باز
کەنـگێ عەیـــاری من بە دنـــەی تـانە کـــەم، دەوێ
دڵ تێـــبگا ئەگـــەر لە تـــەوافـی حەریمـی تـۆ
ســـەر مەیلـی کۆی حیجازی لە شەوقی سەفات ئەبێ
دەسنوێـــژ ئەدی بە خوێنی گەشی چـــاو چۆن بشۆم
نوێـــژێ لە تاقـــی پـــاکی برۆتـا نەبێ، دەچـــێ
وەک مـــەی بە کۆشی کووپـــە هەمیسان گەڕاوە شاد
دوێشـــەو کە بیستی «خاجە» لە ســـاقی حەکـــایەتێ
کوێستانی (کێلـەشیـن)و (سەهـۆڵان) وەکوو «عومەر»
سەربـــەرزی چـــاوەڕێتە کە بـــاڵات دەرکـــەوێ

ای سـرو ناز حسن که خوش می‌روی به نـاز
عشـاق را به نـاز تو هر لحظـه صد نیـاز
فرخنـده بـاد طلـعت خوبـت کـه در ازل
ببریـده‌اند بر قـد سـروت قبـای نـاز
آن را کـه بـوی عنـبر زلـف تـو آرزوست
چون عـود گو بر آتش سـودا به سـوز و سـاز
پروانـه را ز شمـع بـود سـوز دل ولـی
بی شمـع عـارض تو دلـم را بود گـداز
صوفـی که بی تو توبـه ز می کرده بود دوش
بشکست عهـد چون در میخـانه دید بـاز
از طعنـه‌ی رقیـب نگـردد عیـار مـن
چـون زر اگـر برنـد مرا در دهـان گـاز
دل کز طـواف کعبـه کویت وقـوف یافت
از شـوق آن حریـم نـدارد سـر حجـاز
هر دم به خون دیـده چه حاجت وضو چو نیست
بی طـاق ابـروی تـو نمـاز مـرا جـواز
چون بـاده باز بر سـر خـم رفت کف‌زنـان
حافـظ که دوش از لب سـاقی شنـید راز

هیلاکە دڵ وەرە تا هێزی بێتە سەر دیسان
لە بەر نەما نەفەسێ بەشکە بێتە بەر دیسان
وەرن کە دەرکی دییەم ژەندوون بە جۆرێ وا
کە باز بۆ کەسی ناکەم لە تۆ مەگەر دیسان
غەمێ کە گرتی وەکوو لەشکری حەبەش دڵمان
بە هێزی روومەتی رۆمت دەچێتە دەر دیسان
لە جامی دڵ چ تەماشا دەکەم هەموو هەر دێ
خەیاڵی شەوقی جەماڵت بە بەر نەزەر دیسان
سرشکی دیدە بڕێژم لە دووت رۆژ و دەڵێم
شەواری ئاوس ئەبێ چی بزێ سەحەر دیسان
وەرن کە بولبولی خۆش‌دەنگی خاتری «حافز»
بە ئاوەزی گوڵی رووتانە پڕهونەر دیسان
مەقامی ناڵەمی «کۆلیل»! کەس بە دڵ نەشنەفت
تەواوی پەنگە لە گوێما بە بێ‌سەمەر دیسان

درآ که در دل خسته توان درآید باز

بیا که در تن مرده روان درآید باز

بیا که فرقت تو چشم من چنان در بست

که فتح باب وصالت مگر گشاید باز

غمی که چون سپه زنگ ملک دل بگرفت

ز خیل شادی روم رخت زداید باز

به پیش آینه‌ی دل هر آن‌چه می‌دارم

بجز خیال جمالت نمی‌نماید باز

بدان مثل که شب آبستن است روز از تو

ستاره می‌شمرم تا که شب چه زاید باز

بیا که بلبل مطبوع خاطر حافظ

به بوی گلبن وصل تو می‌سراید باز

کــێ بلـێ دەردی عــاشقـان دیســان
وشــری خــوم کەی ئەدا زەمـان دیســان
شــەرمــەزاری گــلاری مــەی‌نۆشـــە
نێــرگزی مەست ئەگەر رووان دیســان
نیـــیە پێــزان بە رازی بـون هــەرکــەس
چەشنـــی لوقمـانی کووپەکـان دیســان
هەرکــە وەك لالــە کاسەگێـــڕی کرد
نوقمــی خوێنـــاوە تا نەمـــان دیســان
دڵ بە لێـــوی نەگرتـــوون جامــــێ
بۆیە وەك خونچـە بەستەمـــان دیســان
چەنگ ئاهــــەنگی زۆری لێــم گــۆڕا
تاڵـــی ببـــڕن! نـەدا زمـان دیســان
ئەجـــەلی «حــافز» ئــەر نەیێ سەهلـــە
حەو کەڕەت دەوری خوم گەڕان دیسان
(شەمســـە) باوانـــەکەم! دڵـی «کۆلیــل»
دەشتــی (ناوەشـتی) دا نیشـان دیســان

حـــال خونیـــن‌دلان که گوید بـــاز
و از فلک خون خم که جویـــد بـــاز

شـــرمش از چشم مـــی پرستـــان باد
نرگـــس مســـت اگـــر برویـــد بـــاز

جـــز فـــلاطون خـــم‌نشین شراب
ســـرّ حکمت به ما که گویـــد بـــاز

هـــر که چون لاله کاســـه‌گردان شد
زین جفـــا رخ به خون بشویـــد بـــاز

نگشـــاید دلـــم چو غنچـــه اگر
ســـاغری از لبـــش نبویـــد بـــاز

بس که در پرده چنگ گفت سخن
ببُـــرش مـــوی تـــا نمویـــد بـــاز

گـــرد بیت‌الحـــرام خـــم حافـــظ
گر نمیـــرد به ســـر بپویـــد بـــاز

دڵــم دەڵێ وەرە گیـــانم لە گـــۆمی مـەی رۆنــێ
لە رۆحی پیـر و جووان خۆش خورۆشی نەی رۆنــێ
دەڵێــن کە چــاکە لە زەریــاشی خەی دەگاتۆ پێت
چ چـــاکە ســاقی ئەگەر من لە بەحری مـەی رۆنــێ
لە دابی مەیکـەدە کـەچ بوو دڵــم خەتــایەتی ئـەو
دوبـارە تۆ بە شــەقـامی کـەرەم رێگەکـەی رۆنــێ
دە بێــنە لەو مــەیە گـوڵوێنــە! عەمبــەرین جــامێ
لە گیـــانی عەتـری گولاوا تەنـووری وەی رۆنــێ
خـــراوی بــادەیە هەرچـەن ســەری خراپ و گێـژ
بە لوتفــی خــۆت لە کـۆشـی بـزەی بـەزەی رۆنــێ
بە نیـــوەشەو دەتـــەوێ رۆژی رون، کەنیشکــی رەز
بە بێ‌حیجــاب، لە جـامێکی جـەم نـەوەی رۆنــێ
مەیێـــڵە رۆژی وەفـــاتم بە خـــاک بسپێـــرن
لە نێــو خومێـکی شەرابـــا لە مەیکـــەدەی رۆنــێ
لە سینگی زڵـمی فەلەک«خاجە»! تیری بەرقی شەراب
شەهـــابی رەجمـی شەیـــاتین و دێوزمـــەی رۆنــێ
لە پیــــری مەیکــــەدە «کۆلیــل» رێنووێنی ویست
وتـی لە باخـــی سنـــەوبەر هــەنـــار و بــەی رۆنــێ

بیـــا و کشتی مــا در شط شــراب انــداز
خروش و ولوله در جان شیخ و شاب انــداز
مــرا به کشتــی بــاده درافکــن ای ســاقی
که گفتــه‌اند نکــویی کن و در آب انــداز
ز کوی میکـــده برگشتـــه‌ام ز راه خطــا
مــرا دگـر ز کــرم بــا ره صــواب انــداز
بیـــار زان مـی گلرنگ مشک بـو جــامی
شـرار رشک و حسـد در دل گلاب انــداز
اگرچـه مست و خــرابم تو نیز لطفی کن
نظر بر این دل سرگشتــه‌ی خــراب انــداز
به نیـــم شب اگرت آفتــاب می‌بایـــد
ز روی دختــر گلچهــر رز نقــاب انــداز
مهـل که روز وفــاتم به خــاک بسپــارند
مــرا به میکــده بر در خـم شـراب انــداز
ز جـور چرخ چو حافظ به جـان رسید دلت
به ســوی دیو محــن ناوک شهـاب انــداز

وەرە لەو ئـــاوی فەرەح‌بەخشە لە نێو جـامی بلوور
بێــنە تا دیــدە پڕی نەبوە لە خــاکی سڕ و ســوور
جێ سەرەنجـام کە ســارایەکی بێ‌دەنگ و هەران
ئێستە بخرۆشـە و هەیوانی فەلەک پڕ کە لە شــوور
چــاوی ناپـــاک لە گیـــانانی نـەزەر چۆنــە رەوا
رووەمـــەتی یـــار تەمــاشا کە بە ئـاوێنەیی نــوور
سێــبەرێ، تۆ بی و ئەو بەژنتــە! ئەی سـەروی بەناز
بکـە بۆ خـاکی لە سەرم و لە سـەرت لاوە غورروور
ژاری ماری ســـەری زولفت نیــیە دەرمـانی مەگەر
ماچی تلیاکی خەت و خاڵت و دەم، باخی چنــوور
حوکمی ئەم کێلگــە دەزانی کە دەوامێــکی نیــیە
گڕی تێـــوەردە بە سۆزی جیگەر و جامی بلـــوور
بە وتەی ئەهلــی دڵ ئەی گەوهـەری تاقانە و پـاک
خۆ بە ئەسرین دەشۆمــۆ بەلــەوەی بێمــە حــوزور
خوایــە ئەو سۆفیــیە خۆبیـــنە کە بەدبیــنە فەقــەت
دووکەڵی ئاخی دڵێکی خەیە سەر جامی شوعوور
یێخە «حافـــز»! وەکو گوڵ دادڕە بۆ عەتر و عەبیــر
عەرعەری قـامەتی چالاکی کە دەرکەوت لە دوور
گیانی «کۆلیل» کە هی خۆتە چلۆن پێشکەشی کەم
سەرە گۆی زولفتـە، چاوم تەمـە، دڵ تاوی تەنـوور

خیـز و در کاسـه‌ی زر آب طربناک انـداز

پیش‌تر زآن که شود کاسه‌ی سر خاک‌انـداز

عاقبت منـــزل ما وادی خاموشـــان است

حالیـا غلغلــه در گنـبد افــلاک انـداز

چشـــم آلوده نظر از رخ جانـــان دور است

بر رخ او نظـــر از آینــــه‌ی پـاک انـداز

به سـر سبـز تو ای سـرو که گر خاک شوم

نــاز از سر بنه و ســایه بر این خاک انـداز

دل مـــا را که ز مـــار ســر زلف تو بخست

از لب خود به شفـــاخانه‌ی تریاک انـداز

ملک این مزرعـــه دانی که ثبـــاتی ندهـد

آتشی از جگر جـــام در امــلاک انـداز

غسل در اشک زدم کـــاهل طریقت گویند

پاک شو اول و پس دیده بر آن پاک انـداز

یا رب آن زاهد خودبین که بجز عیب ندید

دود آهیـــش در آییـــنه‌ی ادراک انـداز

چون گل از نکهت او جـامه قبا کن حافظ

وین قبـا در ره آن قــامت چالاک انـداز

دڵ وەکوو جـاران لە مــاچی لێوی ناکامێـکە هــەر
هەر بە عەشقــی لەعلی تۆ دەستی لە مل جامێـکە هــەر
هەر هەوەڵ ڕۆژم لە دەس دا، دین لە سەر زولفی ڕەشت
تـا بـزانــن دڵ لە دوی ســـەرفی سەرەنجامێـکە هــەر
ساقیــا بۆم تێکــە جـامێ ئـاگرین چونکـوو لە نێــو
عاشقـــانی پوختــی هێما ســـەر گڵـی خامێـکە هــەر
لەو خەتـا کردم چوواندم زولفی وەک موشکی خوتـەن
چەشنی خەنجەر موو لەهەر شوێن و سەرئەندامێکە هـەر
خــۆر لە ڕۆژێکۆ لە خەڵـــوەمدا گزینـگی رووتـی دی
هەر وەکوو سێــبەر لە دەورت عــاشقی جامێـکە هــەر
لێـــوی گیانـــان نێــومی ڕۆژێ کـوتـوپڕ بـردووە
ئەهلی دڵ ئێستەش مەسی بۆی گیان، لە کۆی نامێکە هەر
لەعلی مەیگێڕت ئەزەل جامێـکی خەستی دا بە هەست
تا ئەبــەد سەرخۆش و مەستی جامی گوڵفامێـکە هــەر
بێــخەبەر ئێـژێ هەتا گیــانت نەدەی ئاســوودە نیت
بێخەبەرا گیـانی (گوڵئەنـدام)ـم بە (بـارام)ـێکە هــەر
شەرحــی شیــرینی دەمی تۆی داوە «حافز» گیــانەکەم
ئاوی ژین پەوکێ لەتۆی خامەی شەکەر کامێـکە هــەر
باســی شــەوگاری درێــژی زولفـی تـۆم کردون کە وا
چەشنی «کۆلیل»ـت گوڵۆڵەی زوڵمەتی شامێکە هــەر

برنیامد از تمنای لبت کامم هنوز
بر امید جام لعلت دردی آشامم هنوز
روز اول رفت دینم در سر زلفین تو
تا چه خواهد شد در این سودا سرانجامم هنوز
ساقیا یک جرعه‌ای زان آب آتشگون که من
در میان پختگان عشق او خامم هنوز
از خطا گفتم شبی زلف تو را مشک ختن
می‌زند هر لحظه تیغی مو بر اندامم هنوز
پرتو روی تو تا در خلوتم دید آفتاب
می‌رود چون سایه هر دم بر در و بامم هنوز
نام من رفته‌ست روزی بر لب جانان به سهو
اهل دل را بوی جان می‌آید از نامم هنوز
در ازل داده‌ست ما را ساقی لعل لبت
جرعه‌ی جامی که من مدهوش آن جامم هنوز
ای که گفتی جان بده تا باشدت آرام جان
جان به غم‌هایش سپردم نیست آرامم هنوز
در قلم آورد حافظ قصه‌ی لعل لبش
آب حیوان می‌رود هر دم ز اقلامم هنوز

دڵــــم خـــــراوی پەری شێـــوەییێــکە شۆرەنگێـــز

بەڵێـــــنی لا نیـــــیە خوێن‌ڕێـــژە فێڵەبـاز و بەهێـز

قـــەزای دامەنی چـــاك و دڕاوی گوڵ لە چەمـــەن

لە ســـەد هەزار جبـــەی مەکـر و مێـــزەرەی پارێـز

دەبـــەم بە خـــاك لەگەڵ خۆ خەیـــاڵـــی خـــاڵانت

هەتـــا دەرێ گـوڵی عەمبـــەر لە گۆڕی خـــاڵ‌ئامێز

فریشـتە چون نیـــیە ساقی! لە عەشقی دڵ حـــاڵی

لە خـــاکی ئـــادەمی ئـــاوێ بڕێـــژە کەوســـەربێـــز

لە کفنـــەکەم بخـــە جـامێ هەتـــا لە مەحشـــەردا

بە مـــەی بچێ لە دڵـــم ترسی رۆژی رەستـاخێـز

هـــەژار و غەمـــزەدە هـاتوومە دەرکی رەحمـــەتی تۆ

بە غەیـــری دۆسیـــی ئێـــوەم نەبوو کە دەستـاوێـز

وەرن لە مەیکـەدە دوێشەو سورووشی غەیب ئەیـوت

لە بـــەش مەتـــۆرە کە دەستی قـــەزا بە پیتـــە و پێـز

لە بەینـــــی عاشـــق و مەعشـــووق پەردە «حـافز»! نین

حیجـــابی خۆ کە وەلا دەی سـەحـەر دەکـا ئاخێـز

لە خۆ دەراتنـــە مەرجـــی ئەوین «عومـــــەر»! واتـــە

قولێنـــگی کۆکـەنە شیـــرین، نە ئەفســەری پەروێـز

